# ئادابی تەعزیە و پرسە
# لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

فاتیح مەلا ڕەسول شارستێنی

چاپی یەکەم

٢٠١٤ ز - ١٤٣٥ ک

منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# ئادابی تەعزیە و پرسە
# لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

فاتیح مەلا ڕەسول شارستێنی

چاپی یەکەم
٢٠١٤ ز - ١٤٣٥ ک

ناوی کتێب: ئادابی تەعزیەو پرسە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە
بابەت: وتار
نووسەر: فاتح مەلا ڕەسول شارستێنی
تایپ و دیزاین: جەمال دەروێش
چاپی یەکەم ٢٠١٤ ز ١٤٣٥ ك
تیراژ: ٥٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن:
چاپخانەی زانا

# ئادابی تەعزیە و پرسە
# لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

## پێشکەشە:

- بە خەمخۆرتر لە خۆمان بۆ خۆمان و بەسۆزتر لە دایك و باوكمان بۆمان، ڕێنیشاندەری دونیاو دوارۆژمان، پێشەواو پێغەمبەرمان (ﷺ).

- بە دایك و باوكم.

- بە ڕوحی خوالێی خۆش بێ، خاڵم و مامۆستام، مامۆستا مەلا سەید عەبدوڵڵا شارستێنی، کە بە نەخۆشی كۆچی دوایی کردو مافی زۆری بە سەرمەوەیە، خوای گەورە پاداشتی ئەم نووسینە بخاتە تەرازووی چاكەكانیەوە.

- بە هاوسەری بەڕێزم و مناڵە جوانەکانم، خوای گەورە تەمەنیان پڕ بەرەکەت بکات.

## ئاماژەیەك:

الحَمْدُ لِلهِ الَّذي تَفَرَّدَ بالدَّوامِ والبَقاءِ، وَكَتَبَ عَلى أَهْلِ هذهِ الدُّنيا الفَناء، وَجَعَلَها دارَ إِمْتِحانٍ وابتِلاءٍ، وَجَعَلَ القُبُورَ بَعْدَها لِأَهلِ الإِيمانِ خَيرَ فِناءٍ، والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ، سَيِّدُ الأَصفياءِ، وَخاتَمَ الأَنبياء، وَعَلَى آلِهِ الأَتقياء، وَصَحْبِهِ الأَوفياء، والتَّابعينَ وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسانٍ مادامَتِ الأَرْضُ والسَّماءُ.

خوێنەری بەڕێز: ئەم بابەتەی لەبەر دەست و دیدەتدایە، بریتیە لە چەند وتارێکی ڕۆژانی هەینی، تایبەت بە بابەتی پرسە، کە ئەمڕۆ قسەو باسی زۆری لەسەر دەکرێ و هەندێ کەس داوای لابردن و نەمانی دەکەن و هەندێکیش داکۆکی لە بوونی دەکەن، بەندەش بەم کەمە زانینەی خۆمەوە، چەند وتارێکم لەسەر خوێندەوەو پاشانیش بە باشم زانی کە بە شێوازی نوسین دای بڕێژمەوەو سەرەنجام ئەمەی لێ دەرچوو، لە هەر جێگایەك پێکابێتم و بابەتەکەم لەگەڵ قورئان و سوننەتدا بێتەوە، ئەوە فەزڵ و کەرەمی خوایە، لەو جێگایانەش کە نەمپێکابێ ئەوە نەشارەزایی بەندەیەو خوا لێم خۆش بێ و ئێوەش دوعای خێرم بۆ بکەن، خوای گەورە پشت و پەنای هەموو لایەك بێت.

م. فاتیح شارستێنی

پیرەمەگرون

# بەشی یەکەم

الحَمْـدُ للهِ رَبِّ العالَـين والصَّلاة والسَّـلام عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّـد وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعين

ئیماندارانـــی بەڕێـــز: هیچ کەس نییە لەم ســـەر گـــۆی زەوییە، کـــە بـــڕوای بە مردن نەبـــێ و نەزانێ کە ڕۆژێـــك دێ ئەم دونیایە بەجـــێ دێڵێ، ئەگەرچـــی خەڵکی لە بڕواهێنان بە خوای گەورە بەو ڕوونـــی و ئاشـــکراییە جیاوازییان هەیەو بە ملیـــار کەس هەیە کە مولحیدو بێباوەڕو بڕوای بە بوونی خوا نییە (نَعُوذُ بِالله)، یان بڕوای پێیەتی بەڵام هاوبەشی بۆ بڕیار داوەو موشریکە.. لە بەرامبەریشدا ئیماندارانی بە حەق هەن کە خوایان ناســـیوە لە ڕێگەی قورئان و پێغەمبەری خواوەو دوورن لە شیرك و هاوبەش پەرستی. بەڵێ ئەم خـــوا گەورەیە خەڵکانێك هەن کە بڕوایان بە بوونی نییە. هەروەها بەهەشـــت و دۆزەخ، سزاو خۆشی ناو گۆڕ، وەحی و پێغەمبەرایەتی. ئەمانە هەمووی کەســـانێك هەن کە بڕوایان پێی نەبێ، بەڵام هیچ کەس نییە بڵێ مردن نییەو من ناگرێ و بە ئەبەدی بە زیندوویی دەمێنمەوە.

بەڵێ مردن خاڵی هاوبەشی نیوان هەموو مرۆڤەکانەو کەس نییە بـــڕوای پێی نەبێ، هـــەر بۆیە قورئان مردن بـــە یەقین و دڵنیایی ناودەبـــات و دەفەرموێ: ﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّـــى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾ کە لێرەدا «الْيَقِينُ» بە مانای مردن هاتووە.

جا بە ڕاستی مردن گەورەترین موصیبەتە، خوای گەورە مردنی بە موصیبەت ناو بردووە. ﴿فَأَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةُ الْمَوْتِ﴾ المائدة ١٠٦.

بەڵێ مردنی خۆشەویستان، یەکێکە لە موصیبەت و ناڕەحەتییەکان و مرۆڤی پێ تاقی دەکرێتەوە، ئایا خۆی دەگرێ لەژێر باری خوادا، یان ناشکوری دەکات؟ بەڵێ مردن جەرگبڕو پشت شکێنە، لەو کاتەدا کە جەنازەی خۆشەویســتێکت لەبەر دەســتایە، چاوت تاریك دەبێ، عەقـــڵ کار ناکات، دونیات لێ دێتەوە یەك، لە ورەو ئیرادەی مرۆڤ دێنێتـــە خـــوارەوە. زۆر کەس زۆر خـــۆی بە قارەمـــان و خۆڕاگرو ورەبەرز دەزانێ، ورەی دەخســـتە بەر خەڵکی، بەڵام کاتێ ڕۆڵەیەکی دەمرێ، ئازیزێکی لەدەست دەدا، خۆی بۆ ناگیرێ و پێویستە بگریە، جاران ئەو دڵنەوایی خەڵکی دەکرد، ئێستا پێویستی بەوەیە خەڵکی دڵنەوایی بکەن.

بەڵێ پێویستە کاتێ کەسێکی نزیك و دراوسێمان مردوویەکی لێ دەمرێ و بە تایبەت زۆر کاریگەری لەســـەر داناوە، ئێمەی موسڵمان بـــە دەوریەوە بین و دڵنەوایی بکەین و دوعای خێر بۆ مردووەکەی بکەیـــن و تا ماوەی ســـێ ڕۆژ نان و خواردنیـــان بۆ ئامادە بکەین و

وریایی لە ماڵ و سامان و مەڕومالاًت و کشتوکاڵیان بکەین. ئا ئەمە پێی دەوترێ پرسەو تەعزیە.

بەڵێ تەعزیەو پرسە بەم شێوە شەرعییە مافی موسڵمانە لەسەر موسڵمان. با بچینە خزمەت پێشەواو سەرومرمان محەمەدی مصطفی (ﷺ)، بزانیـــن چـــۆن دڵنەوایی و تەعزیەی لەو کەســـە کردووە، کە کەسێکی زۆر نزیك و خۆشەویستی لەدەست داوە:

<u>بەسەرهاتی یەکەم:</u> پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژانە لەناو صەحابە بەڕێزو ئازیزەکانیدا دادەنیشـــت لەناو ئەو خەڵکەی بە چواردەوری پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دادەنیشتن. پیاوێك بوو، ئەم پیاوە کوڕێکی بچکۆلەی لەگەڵ خۆی دێنا بۆ مەجلیســـی پێغەمبەر (ﷺ)، مناڵەکە دەهاتـــە پشـــت باوکییەوەو دەســـتی لـــە ملی باوکـــی دەکردو خۆی دەخســـتە سەرشـــان و ملی باوکـــی و باوکی ماچ دەکردو باوکیشـــی دەیخســـتە باوەشی خۆیەوەو لە ناخی دڵەوە قوڵپی خۆشەویستی بۆ ئەم مناڵەی دەهاتە دەرەوەو دەستی لە ملی دەکردو سەر کوڵمەکانی و لێـــوو ناودەمـــی کوڕە جوانەکـــەی ماچ دەکـــرد.. پێغەمبەری خوا (ﷺ) ســـەرنجی ئەو خۆشەویستییە بەهێزەی دەدا کە لە نێوان ئەم بـــاوك و مناڵەدا هەیە. بەلاًم ڕۆژێکیان ئـــەم باوك و کوڕە ئامادەی مەجلیســـی پێغەمبەر (ﷺ) نەبوون. بوو بە دوو ڕۆژو سێ ڕۆژ هەر دیـــار نەبوون، بۆیە پێغەمبەری دڵســـۆزو خەمخۆر پرســـی (مالي لا أرى فُلانـــاً؟!) ئەرێ ئەوە بۆچی چەنـــد ڕۆژێکە فلاًن کەس نابینم؟!

«ئەوە ســەرکردەو پیشــەواو ڕابەرە، کە ئاوا خەمــی هاووڵاتییەکی خۆیەتــی، هەرچەندە ئەو هاووڵاتییــە ناودارێك نەبێ، خاوەن پلەو پایەی سیاسی و سەربازیش نەبێ».

صەحابەکان لە وەڵامی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) فەرموویان: **(يا رَسُولَ اللهِ بُنَيُهُ الَّذي رَأَيْتَهُ هَلَكَ)**. ئەی پێغەمبەري خوا (ﷺ)، ئەو کوڕە بچکۆلەی کــە ئەتبینی لەگەڵ باوکیا ئەهاتە مزگــەوت و ئاوها چەندە یەکتریان خۆش دەویســت، ئــەوە ئەو منداڵە جوانە لە کتوپــڕدا مردو باوکەکەی لە تاوی منداڵەکەی لە ژوورەوە دانیشــتووەو ئەژنۆی شکاوەو هەتا بڵێی غەمبارو مەحزوونە بۆی!! پێغەمبەر خوا (ﷺ) دەســت بەجێ هەڵساو لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوەڵانی بەرەو ماڵی ئەو پیاوە بەڕێ کەوت و هەواڵی منداڵەکەی لێ پرسی و ئەویش بۆی باس کرد کە چۆن کتوپڕ مردووەو لەگەڵ باسـکردنیدا، هۆن هۆن فرمێســك بە چاویدا دەهاتە خوارەوەو زۆر غەمبار بوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای خێری بۆ کردو پاشــان فەرمووی: **(يا فُلان، أيُما كانَ أحَبُّ إلَيكَ؟ أنْ تَتَمَتَّعَ بِهِ عُمْرَكَ، أوْ لاتَأْتي إلى بابٍ مِــنْ أبْوابِ الجَنَّةِ إلاّ وَجَدْتَهُ قَدْ سَــبَقَكَ إلَيهِ، يَفْتَحُهُ لَكَ؟!)**. ئەی فلان کەس، ئایا کامیانت بە لاوە خۆشەویسترە؟ ئەوەی کە تەواوی تەمەنت لەگەڵ ئەو کوڕە جوانە خۆشەویســتەت بە یەکــەوە بوونایە، یاخود لە ڕۆژی قیامەتدا، کاتێ کە دەچیتە هەر دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشت، ئەوا ببینــی کە کوڕە جوانەکەت پێشــت کەوتووە بۆ ئــەوێ، ئەو دەرگاکەی بەهەشــتت بۆ دەکاتەوە!! باوکــی منداڵەکە وتی: **(يا نَبيَّ اللهِ، بَلْ يَسْـبِقُني**

إلى بـاب الجنَّـةِ، فَيَفتَحُها، لَهُوَ أَحَبُّ إِلَيّ). ئـەی پێغەمبەر خوا (ﷺ)، بەڵکو ئەوەیانم پێ خۆشترە کە کوڕەکەم بەرەو دەرگای بەهەشت پێشم بکەوێ و دەرگای بەهەشـتم بـۆ بکاتەوە!.. بەڵێ دنیـا هەر کۆتایی دێ، گرنگ ئەوەیە بە هەمیشەیی و بە نەمری لە بەهەشتا بەیەکەوە بین.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (فَذاكَ لَكَ). دە ئەوە بۆ تۆ، ئەوە تۆ بە ویسـتی خوا مسـۆگەری کە کوڕەکەت دەرگای بەهەشـتت بۆ دەکاتەوەو ئەو لە پێش تۆدا گەیشتە ئەوێ، چونکە زووتر مرد!..

یەکێ لەو کەسانەی کە لە خزمەت پێغەمبەردا بوو (ﷺ)، کە ئەم مژدە خۆشەو ئەم دڵدانەوە گەورەی بیست فەرمووی: (يا رَسُولَ اللهِ، أَلَهُ خاصَّةً؟! أَمْ لِكُلِّنا؟! قالَ: بَلْ لِكُلِّكُمْ). ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا ئەم مژدە گەورەو ئەم خۆشـییە هەر تایبەتە بەم پیاوە کە ئێستا ئێمە لە لای دانیشـتووین، یان بۆ هەموومانە، بۆ هەموو ئوممەتەکەتە؟! فەرمـووی: بۆ هەمووتانە، هەر کەسـێك لـە ئوممەتەکەم منداڵێکی نابالغـی بمرێ و وەکو ئەم پیاوە بۆی جەرگسـووتاوو غەمبار ببێ و توانـاو هێزی لەبەر ببڕێ، ئەوە بە ویسـتی خـوا، خوای گەورە بەهەشـتی پێ خـەڵات دەکات و لـە ڕۆژی قیامەتدا ئـەو منداڵەی دەرگای بەهەشتی بۆ دەکاتەوە..

ئەم فەرموودەیە (أَخرَجَهُ النَّسائي، صَحيح سُنَن النَّسائي، رقم ١٩٧٤).

لە ڕیوایەتی ئیمام ئەحمەددا (٤٣٦/٣) هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ ئەو کوڕەکەی دەبینی کە ئاوا لە باوەشـی باوکیایەتی و

باوکی سەری ماچ دەکات و بۆنی پێوە دەکات و کوڕەکەش دەستەکانی باوکی ماچ دەکات. پێغەمبەر (ﷺ) بە باوکەکەی فەرموو: (تُحِبُّهُ؟!) زۆرت خۆش دەوێت؟! کابرا وتی: (أَحَبَّكَ اللهُ كَما أُحِبُّهُ). یا ڕەبی خوای پەروەردگار خۆشی بوێی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بە ئەندازەی ئەوەی کە من ئەم کوڕەمم خۆش دەوێت.. سەیرکەن چەند بە زیرەکانە دەری بڕی کە چەندە کوڕەکەی خۆی خۆش دەوێت.

کەواتە بەم تەعزیەو دڵدانەوەیە، ئاو کرا بە دڵی سوتاوی ئەو باوکە جەرگ سووتاوەدا. بەڵێ ئەمە پرسەو تەعزیەکردنی پێغەمبەر خوایە (ﷺ) کە ئاوا سێبوری دەدا کە بە دڵی زامدار، وە بەو کەسانەی دەفەرموو کە منداڵیان دەمرد: (بَخٍ بَخٍ، وأشارَ بِيَدِهِ: لَخَمسٌ ما أَثْقَلَهُنَّ في الميزان، سُبحانَ اللهِ والحَمدُ لِلهِ، ولا إلهَ إلاّ اللهُ واللهُ أكبَر، وَالوَلَدُ الصَالِحُ يُتَوَفَّى لِلمَرءِ الْمُسلِمِ فيَختَسِبُهُ) (صحيح رَواهُ النّسائي - صَحيح الجامِع: ٢٨١٧).

واتە: ئای چەند گەورەیە، ئای چ پاداشتێکی بەنرخە. ئەمجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژەی بە دەستی کردو پەنجەکانی هەڵبڕی و فەرمووی: ئای ئەم پێنج شتە چەندە قورسن لە تای تەرازووی مرۆڤی موسڵماندا. ئەو پێنجەش: سُبحانَ اللهِ والحَمدُ لِلهِ، ولا إلهَ إلاّ اللهُ واللهُ أكبَر.. پێنجەمیشیان منداڵێکی صاڵح و خواناس و جوانخاس کە بمرێ و جەرگی دایکی و باوکی بسووتێنێ و ئەو دایك و باوکەش ئارام بگرن و ناشکوری نەکەن و سوپاسی خوا بکەن. ئای ئەجرو پاداشتی ئەو منداڵ مردنە چەند لە تای تەرازوویاندا قورسە.

بەسەرهاتی دووەم: پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) هەمیشە سەردانی مەدینەییەکانی دەکردو پرسیاری حاڵ و ژیانیانی دەپرسی، ڕۆژێکیان هەواڵــی پێ گەیشــت کە ئافرەتێکی ئەنصاری، کــە تاقە یەك کوڕی هەبــوو، کوڕە تاقانەکەی مردووەو بە ڕاســتی حاڵی پەشــێوە بۆی، چونکە مێردی نەمــاوەو پیر بووەو تەنها هەر ئەو کوڕەی هەبووەو زۆر کوڕێکــی دڵســۆزو باش بووە. پێغەمبەر خــوا (ﷺ) هاوەڵەکانی کۆکــردەوەو فەرمــووی با بڕۆین بۆ لای ئەو دایکە جەرگســووتاوەو تەعزی و پرسەی لێ بکەین و دڵنەوایی بکەین. «ئا ئەمە سەرکردەیە، هاوبەشی خەمی پیرەژنیکی دڵبەخەمە، کە ڕۆڵەی دڵسۆزی لەدەست داوە». کاتــێ گەیشــتنە دەرگای ماڵی پیرەژنەکــە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بــە صەحابەیەکی فەرموو، بەڵکــو ئیزنی چوونە ژوورەوەمان بۆ وەربگــری. ئەویش بە ئافرەتەکەی ڕاگەیاندو پیرەژنەکەش وتی: پێغەمبەری خواو هاوەڵانی دەخەمە ســەر ســەرو سەرچاوم. زۆر بە گەرمی و حورمەتەوە پێشــوازی لێ کردن و دوای کەمێ دانیشــتن، پێغەمبەری خــوا (ﷺ) ڕووی کردە پیرەژنەکەو فەمووی: (قَدْ بَلَغَنِي إِنَّــكِ جَزَعْتِ عَلى إبنِكَ، فأَمَرَها بِتَقوى اللهِ وَالصَّبرِ) پێم گەیشــتوووە کە بە ڕاستی تۆی دایکی دڵسۆزو میهرەبان زۆر نارەحەتی بۆ کوڕەکەت، زۆر دڵبەخەمی بۆ لەدەســتدانی ئازیزە تاقانەکەت، بەڵام من هاتووم دوعــای بەخێرت بۆ بکەم و پێت بڵێم کە تازە کوڕەکەت نایەتەوەو زیندوو نابێتەوە، ئەوەی ســوود بە تۆ دەگەیەنێ ئەوەیە کە تەقوای

خوا بکەی و زیکرو یادی خوای خۆت بکەی و ئارام بگری. ئافرەتەکە وتی: (یارَسولَ اللهِ، مالي لا أَجزَعُ وَإِنّي إمرَأَة رَقوب لا أَلِدُ، وَلَمْ يَكُن لي غَيرَهُ؟) ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن دڵتەنگ نەبم، چۆن بتوانم خۆم بگرم و ئاهوناڵەم دەرنەبڕم، لە کاتێکدا من ئافرەتێکم تازە هیچ منداڵی ترم نابێ و لە تەمەنی منداڵبووندا نەماوم، غەیری ئەم تاقە کوڕەشم هیچ ئەولادی ترم نییە. ئیتر چۆن بتوانم دڵی خۆم بدەمەوە؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (الرَّقوبُ الّذي يَبقى وَلَدُها) وەجاخ کوێرو بێ ئەولاد ئەو کەسەیە، کە ئەولادەکەی بۆ دەمێنێ و ئەم لە پێش منداڵەکەیەوە دەمرێ. پاشان فەرمووی (مامِن امْرِيءٍ أَوْ إمْرَأَةٍ مُسلِمَةٍ يَموتُ لَها ثَلاثَة أَولاد، يَحتَسِبُهُمْ إلاَّ أَدخَلَهُ اللهُ بِهِمُ الجَنَّةَ).

واتە: هەر پیاوێك یان هەر ئافرەتێکی ئیماندار سێ منداڵی بمرێ و ئەویش ئارامیان لەسەر بگرێ و ناڕەحەتی و ئازاری جەرگسووتانەکەی بە صەبرگرتن و سوپاسی خواو دڵخۆشبوون بە پاداشتی نەبڕاوەی خوا دابمرکێنێتەوە، ئەوە خوای گەورە بە هۆی ئەو سێ منداڵەیەوە دەیخاتە بەهەشتەوە.. بەهەشتی خوای بۆ مسۆگەر دەبێ.

لەو کاتەدا حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب لە لای ڕاستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەستابوو، فەرمووی: (بِأَبي أَنتَ وأُمّي، واثنَينِ؟ قالَ واثنَينِ). بە دایکم و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی ئەگەر یەکێ دوو منداڵی مردبێ؟ فەرمووی: ئەگەر کەسێك دوو منداڵیشی مردبێ و صەبرو ئارام بگرێ، ئەوە خوای

گــەورە لە پاداشــتی ئەو جەرگســووتان و ئازارە بەســوێیەی منالّ مردنــدا، خــوای گەورە بەهەشــتی پێ خەلاّت دەکات و بەهەشــتی خوای مسۆگەرە..

ئەم فەرموودەیە: (حَديثٌ حَسَنٌ، أَخرَجَهُ الحاكم١/٣٨٤) (وقال صَحيحُ الأِسناد).

لەم دوو بەســەرهاتەدا کە باسمان کردن، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە پرســەو تەعزیە هەم لــە پیاو دەکرێ هەم لــە ئافرەت دەکرێ و دڵدانەوەیــان بــە دوعــای خێرو بیرخســتنەوەی پاداشــتی خوا دەکرێت.

بەڕێزان: تەعزیەو پرســەو دڵدانەوەی خــاوەن مردوو، لە دوای ناشــتنی مــردوو دەکــرێ، هەر وەکو لــە پێش بە خاك ســپاردنی مردووەکەشــدا هــەر درووســتە، وەکو لــەم فەرموودەیــەدا بۆمان دەردەکەوێت، ئومو ســەلەمە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (دَخَلَ رَسُــولُ اللهِ (ﷺ) عَلى أَبي سَــلَمَةَ، وَقَدْ شَــقَّ بَصَــرُهُ، فَأَغْمَضَهُ، ثُــمَّ قالَ: إِنَّ الرُّوحَ إِذا قُبِضَ تَبِعَهُ البَصَرُ). واتە: پێغەمبەر خوا (ﷺ) هات بۆ ســەر جەنازەی ئەبی ســەلەمە، کە ڕوحی دەرچوو بــوو، چاوی کرابۆوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی بۆ نوقاندو چاوەکانی خستە سەریەك، پاشــان فەرمووی: بە ڕاســتی ڕۆح کاتێ دەردەچێ لە لاشە، چاو بە شــوێنیەوەیەتی و بە دویدا دەڕوانــێ.. لەو کاتەدا: (فَضَــجَّ ناسٌ مِنْ أَهْلِهِ). کۆمەڵێ لە کەسوکاری دەستیان کرد بە هات و هاوارو گریان و

لەخۆدان. پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموون: (لاتَدعُوا عَلى أنفُسِكُمْ إلاَّ بِخَيرٍ، فَإنَّ المَلائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلى ماتَقولُونَ). واتە: دوعا لە خۆتان مەکەن مەگەر دوعای خێر بۆ نەفسی خۆتان بکەن، کە مردووتان لێ مردو زۆر بۆی بە پەرۆش بوون، دوعای خراپ لە خۆتان مەکەن وەکو ئەوە بڵێن: خوا کوێرم کا چۆن فلان کەس مرد، یان بڵێی یاخوا نەمێنم، خۆزگە منیش دوای تۆ بمرم، بەڵکو لە جیاتی ئەوە دوعای خێر بکە بۆ خۆت و بۆ مردووەکەت و بڵێ خوایە ڕەحمم پێ بکەی، خوایە صەبرم بدەیتێ، خوایە لە مردووەکەم خۆش بی، چونکە بە دڵنیاییەوە فریشتەکان ئامین دەکەن بۆ ئەو دوعایانەی کە ئێوە دەیکەن و ئەو قسانەی کە ئێوە دەیڵێن لەو کاتەدا کە لەسەر جەنازەی مردوویەك دانیشتوون!..

ئومو سەلەمە دەفەرموێ، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَبي سَلَمَةَ، وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ في المَهديِّينَ، واخْلُفْهُ في عَقِبِهِ في الغابِرِينَ، وَاغْفِرْ لَنا وَلَهُ يا رَبَّ العالَمينَ، وافْسَحْ لَهُ في قَبْرِهِ، وَنَوِّرْ لَهُ فيهِ).

واتە: خوایە لە ئەبی سەلەمە خۆش ببەو پلەوپایەی لە ناو ڕێنماییکراواندا بەرز بکەرەوەو لە دوای ئەویش بە زیندووەکان جێگەی پڕ بکەرەوەو لە ئێمەش و لەویش خۆش ببە، ئەی پەروەردگاری جیهانەکان، وە گۆڕەکەی بۆ فراوان و ڕووناك بکەرەوە. ئەم فەرموودەیە (رَواهُ مُسلِم: ٩٢٠، وَأبو داود: ٣١١٦ و غَيرِهِما)..

لەم فەرموودەیەوە تێ ئەگەین کە پرسەو تەعزیە دوو بەشە:

دوعا بۆ مردوو، دووعا بۆ کەسوکارە زیندووەکەی و دوعا بۆ خۆشت - ئەو کەسەی کە دەچێ بۆ پرسەکە.

ئیمانداران: درووستە تەعزیەو دڵدانەوەو چوون بۆ سەردانی خێزان و ماڵ و مناڵی کۆچ کردووەکە ئەگەرچی سێ ڕۆژ دوای مردنەکەش بێ. هەروەکو لەم فەرموودەیەدا بۆمان دەرکەوێ: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپای ئیسلامی بەڕێ خست بۆ جەنگ، بۆ جەنگی موئتە. فەرمووی: ئەی سوپای موسڵمانان ئاگادار بن و بزانن، کە زەیدی کوڕی حاریسە فەرماندەو سوپاسالاری ئەم لەشکرەیە، جا ئەگەر زەید شەهید بوو، ئەوا لە شوێنی ئەو (جەعفەری کوڕی ئەبو طالب) دەبێتە فەرماندەتان، هەرکات ئەویش شەهید بوو عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە دەبێتە فەرماندەتان لە جێگای ئەو، ئەگەر ئەویش شەهید بوو ئەوە دواتر خۆتان لەناو خۆتاندا سەرکردەیەك هەڵبژێرن و بە گوێی بکەن.

بەڵێ ئەم سوپایە بەڕێ خراو دوای نزیکەی مانگێك، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتێکدا لەناو هاوەڵانی دانیشتبوو لە مزگەوتی پیرۆزی لە شاری مەدینە، لە ناکاو غەمباری و مەحزوونی کەوتە سەر دەم و چاوی، چاوە جوان و پیرۆزەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، پاشان سەری هەڵبڕی و فەرمووی: (إنَّ إخوانَكُمْ لَقُوا العَدُوَ، وإنَّ زَيْداً أخَذَ الرَّايَةَ فَقاتَلَ حَتَّى قُتِلَ واستَشْهِدَ...) واتە: بە ڕاستی برایەکانتان ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە، ئەوە زەید ئاڵاکەی هەڵگرت و جەنگا هەتا کوژراو گەیشتە پلەی شەهیدی، ئەمجا جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرت و ئەویش

جەنگا هەتا دەستی ڕاستی پەڕی، بە دەستی چەپی ئاڵاکەی هەڵگرت، ئەویشــیان پەڕاند، ئەمجا بە نێوانی هەردوو ڕانی ئاڵاکەی هەڵگرت، هەتا شەهیدیان کرد. دوای ئەو عەبدوڵڵا ئاڵاکەی هەڵگرت و جەنگا هەتا ئەویش کوژراو شەهید بوو، پاشان شمشێرێك لە شمشێرەکانی خوای گەورە ئاڵاکەی بەدەســـتەوە گرت و موســڵمانانی ڕزگار کردو سەرکەوتنی بەدەست هێنا.. ئەمجا دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی شەهیدبوونی جەعفەری گەیاندە خێزانەکەی. (ثُمَّ أمْهَلَ آلَ جَعْفَرَ ثلاثاً) ئەمجا مۆڵەتی بنەماڵەی جەعفەری دا تا ســێ ڕۆژ، تا ســێ ڕۆژ دوای ئەوە سەری لێ نەدان. (ثُمَّ أتاهُمْ، فَقالَ: لاتَبْكُوا عَلى أَخي بَعْدَ اليَوْمَ) ئەمجا دوای ســێ ڕۆژەکە چوو بۆ لایان و فەرمووی: لەمــڕۆ بەدواوە لەســەر براکــەم -جەعفەر- مەگرین و شــیوەن و هاواری بۆ مەکەن، پاشــان فەرمووی: (ادْعُوا لي ابنَي أَخي) بانگی دوو برازاکەمم بۆ بکەن. کوڕەکەی جەعفــەر دەفەرموێ: (فَجيءَ بِنا كَأَنَّا أَفْـراخ) ئێمەیان هێنا دەتگوت بەچکــەی باڵندەین. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أدعُوا لي الحَلاّق) بانگی سەرتاشم بۆ بکەن، سەرتاش هات و سەری بۆ تاشین، پاشان فەرمووی: (أَمّا مُحَمَّد فَشَبيهُ عَمِّنا أَبي طالب، وَأَمّا عَبْدُالله فَشَبيهُ خَلْقي و خُلُقي)..

واتــە: ســەبارەت بە موحەمــەد، لە ئەبی طالبــی مامەمان دەچێت «ئەمــە مەدح و ستایشــە بــۆ ئەم منالە کە بە ویســتی خــوا وەکو مامەمان ئەبو طالب پیاوێکــی بەڕێزو خاوەن قەدری لێ دەردەچێ».

بەلاّم عەبدوللاّ، لە شـــێوەو لە ڕەوشـــتدا لە من دەچێت.. بەڵێ ئەمە مانای هاندان و دڵدانەوەی منالّە کە پێیان دەڵێ: هەســـت مەکەت کە لێتـــان قەوماوە، نەخێر، ئێـــوە دوو پیاوی گەورەتـــان لێ دەردەچێ!! ئەمەیە ئادابی پرســـەو تەعزیە، ئاوا هیمەت بخەیتە بەر منالّی کۆچ کـــردوو، نەك وەکو هەندێ کەس لە جیاتی هیمەت بەرزکردنەوە، کە چاوی بە منالّە بچووکە کەم تەمەنە بێ باوکەکان دەکەوێ دەڵێ: ئای چـــۆن لێتان قەوما!! بەڵێ عەبدوللاّی کوڕی جەعفەر دەفەرموێ: من هەرچەنـــدە منالّ بووم، بەلاّم عەرەبانەیەکی بچکۆلەم دانابوو، شـــتی وردەوالّەم لەســـەر دەفرۆشـــت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی گرتم و فەرمووی: (اللَّهُمَّ اخلف جَعْفَراً فِي أَهْلِهِ، وبارِك لِعَبْدالله في صفقة يَمينِهِ)..

ســـێ جار لەسەر یەك فەرمووی: خوایە جێگای جەعفەر لە مالّ و خێزانیدا پڕ بکەرەوەو بەرەکەت بڕێژە بەسەر عەبدوللاّ لە کارو پیشەیدا.. ئەمجا عەبدوللاّی کوڕی جەعفەر دەفەرموێ: (فَجاءَتْ أُمُّنا، فذكـرت لَهُ يتمَنا، فقالَ (ﷺ): العيلَةَ تخافـينَ عَلَيهِم، وأنا وليُّهُمْ في الدُّنيا والآخِرَة؟!). واتە: دایکم هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، دایکیشـــم باسی هەتیوی و بێ باوکی و داماوی ئێمەی بۆ کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوە لە هەژاری و دەســـتکورتی و نەداری لێیان دەترسی، خەمی ئەوەتە کە نەدارو موحتاج بن. لە کاتێکا من سەرپەرشتیارو خەمخۆریانم لە دونیاو قیامەتدا.. ئەم فەرموودەیە: (حَديثٌ صَحيح، أخرَجَهُ أحمد، رقم ١٧٥٠ بأسنادِ صَحيح عَلى شَرطِ مُسلِمٍ)...

بەڵێ ئیمانداران: لەم فەرموودەیەوە تێ دەگەین کە پرسەو تەعزیەکردن لە کەسوکاری مردوو، چۆنیەتی دیاریکراوی هەیە، بەڵام کات و شوێنی دیاریکراوی نییەو نابێ تایبەت بکرێ بە شوێنێکەوە، بەڵکو لە کوێ تووشیان بووی لەوێ پرسەیان لێ بکەو دوعای خێر بۆ مردووەکەیان بکەو دوعای خێرو دڵدانەوە بۆ ماڵ و منالی کۆچکردوو بکە.

بەلێ بۆمان دەرکەوت کە تەعزیەو دڵدانەوەی کەسوکاری مردوو، لە سوننەتی پێغەمبەری پێشەوامانە (ﷺ)، ئەی پاداشتەکەی چییە؟ پیغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (مَنْ عَزَّى أَخاهُ المُؤمِنَ في مُصيبَةٍ، كَساهُ اللهِ، حُلَّةَ خَضْراءَ، يُحْبَرُ بِها يَوْمَ القيامَةِ، قيلَ يا رِسولَ اللهِ، ما يُحْبَرُ؟! قال: يُغْبِطُ).. حَديثٌ حَسن، حَسَّنَهُ الألباني، أحكام الجنائز: ١٦٣.

واتە: هەرکەسێ دڵی ئیماندارێك بداتەوەو دڵنەوایی بکات و بە دەمیەوە بێت لە کاتی موصیبەتدا، ئەوە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا پۆشاکێکی سەوزی لە بەرگی بەهەشت لەبەر دەکاو خەڵکی خۆزگەی پێ دەخوازن، لە جوانی ئەو جلوبەرگە نایابە..

لە فەرموودەیەکی تردا، پیغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (مامِنْ مُؤْمِنٍ يُعَزِّي أَخاهُ بِمُصيبَةٍ، إلاَّ كَساهُ سُبْحانَهُ مِنْ حُلَلِ الكَرامَةِ يَوْمَ القيامَةِ) صَحيح سُنَن إبْنُ ماجَة: (١٣١١).. قال الألبانيُ: حديثٌ حَسَن أَخْرَجَهُ إِبْنُ ماجَة (١٦٢٤).

بەڵام: ئایا هەموو جۆرە پرسەو تەعزیەکردنێك ئەو پاداشتەی هەیە؟!

لــە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، کاتێك تەعزیەکردن ئەو پاداشــتەی هەیــە کــە بە گوێرەی شــەرع بــێ، ئەمــەش هەندێ لــە مەرجە شەرعییەکانی تەعزیە:

خاڵی یەکەم: بە پێی شەرع تەعزیەی لێ بکەی: ئیمامی نەوەوی لە کتێبی «الأذكار»دا ئەفەرموێ: چاکترین وشە کە دڵنەوایی خاوەن مردووی پێ بکرێ ئەمەیە: (إِنَّ لِلهِ ما أَخَذَ، وَلَهُ ما أَعْطى، وَكُلُّ شيء عِنْدَهُ بأَجَلٍ مُسَمَى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِب). رَواهُ البخاري: (١٢٨٤) وَمُسْلِم: (٢١٣٢).

واتە: ئەوەی خوا دەیدا بە بەندەی خۆی تا ماوەیەك و لە پاشــا ئەیباتــەوە بۆ خەزێنەی خۆی، هی خۆیەتی، هەروەها ئەوەشــی کە خودا دەیبەخشێ بە بەندەی خۆی تا سەر، ئەویش هەر هی خۆیەتی، وە هەموو شــتێکیش لە لای خوا ماوەیەکــی دیاریکراوی هەیەو کە ئاکامی هات ئیتر پاش و پێشــی نییەو ماوەی بەســەر دەچێ، دە با ئارام بگرێت و چاوەڕوانی پاداشتی خودا بکات..

یاخــود: وەکو لە کتێبە شــەرعیەکاندا هاتووە لە کاتی پرســەدا بڵێی: (أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ). یاخود (أَحْسَـنَ اللهُ عَزاءَكَ). هیچ خراپەیەکی تێدا نییە.

یاخود لە کاتی پرســەدا بڵێی بە خاوەن مــردوو: (أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ وأَحسَنَ عَزاءَكَ وغَفَرَ لِمَيِّتِكَ). واتە: خوا پاداشتت گەورە بکاو خوا سەبرو دڵنەواییەکی جوانت بداتێ و خوا لە مردووەکەت خۆش ببێ..

بــەڵام بە ڕاســتی ناجوان و ناشــەرعییە بڵێــی: عومری درێژی

بۆ خۆتان بەجێ هیشتبێ، چونکە عومری کەس و تەمەنی کەس ناچێتە سەر تەمەنی کەسێکی تر!!

یاخود بوترێ: بۆ خۆتان سەلامەت بن!! باشە خۆ ئاژەڵی مردار نەبۆتەوە؟!!

ئیمانداران: بە ڕاستی ئەوەی کە باب و باپیرانمان لە کوردەواری خۆماندا بەکاریان هێناوە کاتی چوونە پرسەی کەسێکەوە کەوتوویانە: (خوا لێی خۆش بێ) جوانترین دەربڕینە، لەبەرئەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لە سەرە کە دەفەرموێ: (مَنْ إِسْتَغْفَرَ لِلمُؤْمِنينَ ولِلمُؤْمِناتِ، كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً). حَديثٌ صَحيح. صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الجامِع: (٦٠٢٢).

واتە: هەر کەسێك داوای لێخۆشبوون بۆ هەر پیاوێك و ئافرەتێکی باوەڕدار بکات، ئەوا خوای پەروەردگار بە هەموو ئافرەتێك و پیاوێکی ئیماندار چاکەیەکی بۆ دەنوسێت..

خاڵی دووەم: بۆ ئەوەی پرسەکەت شەرعی بێ، پێویستە لە ماڵی مردوو خواردن و خواردنەوە نەخۆی، بەڵکو سوننەتە ماڵی مردوو، دراوسێی و خزمەکانی شەوو ڕۆژێك نانیان بۆ حازر بکەن و زۆریان لێ بکەن بۆ ئەوەی خواردن بخۆن، هەروەکو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (إِصْنَعُوا لِآلِ جَعْفَرَ طَعاماً، فَإِنَّهُ قَدْ جاءَهُمْ ما يَشْغَلُهُمْ) رواهُ الترمذي وأبو داود بِسَنَدٍ صَحيحٍ.

واتە: خۆراك بۆ بنەماڵەی جەعفەر دروست بکەن، چونکە ئەوان

بە هــۆی مردووەکەیانەوە نایانپەرژێتە ســەر نــان ئامادەکردن بۆ خۆیان.

بەڕێزان: لە هەموو کتێبە شــەرعیەکاندا دەفەرموێ: ناپەسەندە کەســوکاری مردووەکە خواردن دروست بکەن، تاکو خەڵکی کە هاتن بۆ پرسەکەیان لێی بخۆن.

(جەریری کوڕی عبدالله البجلی) دەفەرموێ: (كُنّا نَعُدُّ الجُلوسَ - وفي روايَةِ- نَرى الإجتِماعَ إلى أهْلِ المَيْتِ، وَصنيعَةَ الطّعامِ بَعْدَ دفنِهِ مِنَ النِّياحَةِ) رواهُ أحمد وابنُ ماجَة - صَحيح إبنُ ماجَة برقم (١٣٠٨).

واتە: ئێمە دانیشــتن و دروستکردنی خواردنمان لە دوای ناشتنی مردوو بە شینگێڕان دادەنا، یان دەزانی..

جا ئەمە لە کاتێکدا ناپەســەندە کە ماڵی مردووەکە بەشی شێت و هەتیوی تێدا نەبێ، ئەینا حەرامە.. لێرەدا چارەســەر ئەوەیە کە: ئەگەر هەر ناچار بوون بە نان دروستکردنی تەعزیە ئەوا: دراوسێ و خزم و ئەهلی گەڕەك نان بەرن بۆ ماڵی خاوەن تەعزیەو ئەوانیش بە میوانەکانی ببەخشن.. یان لە نێوان ئەندامانی بنەماڵەو بەرەباب و گوندێکــدا، صندوقێك دابنرێ و هەرکەس بــە پێی توانای خۆی پارەی تێ بکات و بۆ هەموو تەعزیەیەك لێی خەرج بکرێ.

بەڵام ئەمڕۆ کە چێشــتخانە (مطعم) و دوکان لە هەموو شــوێنێ هەیە، چاکتر وایە ئەو کەسەی کە ناچارە بە مانەوەی لە ماڵی خاوەن پرسەو شــوێنی پرسەکە، لەو شــوێنانە بە پارەی خۆی نان بخوات..

بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ خاوەن مردوو هێشتا لەسەر قەبرانەو جارێ مردووەکەی نەشاردۆتەوە دەبێ خەمی نان دروستکردنی تەعزیەکەو شوێن جێگاو ئافرەتی چێشت لێنەرو لافیتە نووسین بخوات. خەڵکێکی بێویژدانی لە دین ناحاڵی. کە دەشچێتە تەعزیەکەو دەمێنێتەوە، گلەیی ئەوەی کردووە کە بۆ چی گۆشتەکە لەناو شلەدایەو سورنەکراوەتەوە!! بڕواتان ببێ کەســـی وا هەبووە لەناو تەعزیـــەدا وتوویەتی من فلان نەخۆشیمە، ئەگەر بکرێ گۆشتم بۆ ببرژێنن باشترە!! ئەمانە هەمووی حەرامن، بەڵێ ئەمڕۆ ئەم شـــێوازە لە تەعزیەو دروســـتکردنی نانی تەعزیـــە وای کردووە کە تەعزیەو پرســـە پێچەوانە بۆتەوە، ئێســـتا دەبێ خاوەن مردووی جەرگ ســـوتاوی پشـــت شکاو، دڵی ئەو کەسانە ڕابگرێ کە هاتوون بۆ پرســـەکەی، دەبێ لە خەمی ئەوەدا بێ خەڵکی گلەیی لێ نەکەن کە نان و ئاوو جێگەکەی باش نەبووە!!

ئیمانداران: هەر لە بارەی نانی تەعزیەوە، ئەگەر یەکێ پرســـیار بکات و بڵێ: باشە ئەگەر کەسێك لە ژیانی خۆیدا وەصیەت بکاو بڵێ: هەر کات مردم، لەسەر ماڵ و سامان و پارەی خۆم نانی تەعزیەکەم دروســـت بکەن و بیـــدەن بەو خەڵکەی دێت بۆ پرســـەم، ئایا ئەمە دروســـتەو شەرعییە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: ئیبن حەجەر دەفەرموێ: مادام دانیشـــتن و نانخواردن لە تەعزیەدا مەکروهـ و ناپەســـەندەو «زۆرجار بە تەواوی حەرامە» ئەوا وەصیەتەکەشی بۆ دروستکردنی نانی تەعزیە لەسەر ماڵی خۆی حەرامەو ناشەرعیە.

وە ئەگەر ماڵی مردوو نانیان دروست کرد، با بە پارەی خۆشیان نەبێ، ئایا دروســـتە لێی بخورێ؟! بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە با بچینە خزمەت مامۆستای مامۆستایان، عەللامەی زەمان، شافیعی سەردەم، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە لە کتێبە زۆر بەنرخ و ناوازەکەیدا «جواهر الفتاوى ج ١ ص ١٧٧»دا دەفەرمــوێ: (إنْ كان بَعْضُ الوَرَثَـةِ غائِباً، أو صَنَعُوهُ إِسْـتِحْياءً وَخَوْفاً مِنْ نِسْبَةِ اللَّوْمِ إِلَيْهِمْ فَحَرامٌ، وَلا يَجُوزُ أَكْلُهُ مُطْلَقاً).

واتـــە: ئەگەر بە پارەی مردووەکە نانی تەعزیەکە دروســـت کرا، ئەوە تەماشـــا دەکەین، ئەگەر هەندێ لـــە میراتگرەکانی مردووەکە لـــەوێ نەبـــوون، لە دەرەوەی وڵات بوون، لە شـــارێکی تر بوون، یان ئامادە بوون بەڵام پرســـیاریان لـــێ نەکرابوو کە ئایا ڕازین لە ماڵی ئـــەم مردووەمان نانی تەعزیە دروســـت بکەین وەکـــو هەندێ جار «بەڵکو زۆر جاریش» کوڕەکانی مردوو بۆ شـــان و شەوکەتی خۆیان لەســـەر پارەی باوکی مردوویان نانی زۆر باش بۆ تەعزیە دەکەن و مەصرەفی زۆر دەکەن، بەڵام هیچ پرس و ڕاوێژێك بە خوشکەکانیان ناکەن، یان ئەگەر پرس بە میراتگرەکان کرا، بەڵام هەیانبوو لە ڕوو دادەماو پێی عەیب بوو بڵێ من پارەی خۆم کە لەو میراتییە بەرم دەکـــەوێ، نایکەم بـــە نان و نایدەم بە خەڵك -لە دڵەوە دەیگوت بە سندانیان بێ و بە زمان دەیگوت نۆشی گیانیان بێ - ئەوە ئەو نانە هەرچەندە بە پارەی خودی مردووەکە کراوە هەر حەرامە!..

هەروەهــا ئەگــەر کەســوکاری میراتگری مردووەکــە، بە پارەی مردووەکەیــان نانی تەعزیەیان دروســت کرد، بــەڵام لەبەر ئەوەی ئابــڕووی خۆیان بپارێزن و لە ڕوو دامابوون و ناچار بوون کە ئەو نانــە ئامادە بکــەن، چونکە تازە ببوو بە عورفــی کۆمەڵگا، یان لە ترســی ئەوەی کە خەڵکی لۆمەیان بکــەن و بە ڕەزیل و چرووك و بێوەفــا بۆ باوك و دایك و مردووەکەیان ناویان ببەن، چونکە نانی تەعزیەیــان ئامادە نەکردووە، ئەوە (فَحَــرامٌ) ئەو نانە حەرامەو بە هیچ شێوەیەك دروست نییە لەو نانە بخورێ!!!

ئەمجا ئەگــەر دانیشــتوانی گوندێك، گەڕەکێــك، کردبوویان بە عــادەت لەناو خۆیاندا کە هــەر کات مردوویەکیان لێ مرد، هەموو خەڵکی ئەو شــوێنە نان بەرن بــۆ ماڵی مردووەکە یان بۆ مزگەوت و پرســەخانەکە، بۆ ئەوەی هەم خاوەن نان خۆی لەوێ نان بخواو هەم میوانێکیش لەگەڵی بخوات. ئەوە لە بارەی خواردنی ئەم جۆرە نانەشــەوە، مامۆســتا مەلا عەبدولکەریم دەفەرمــوێ: (فَالأَحْتِياطُ وَالتَّوَرُعُ أَن لايَأْكُلَ الإِنْســانُ مِنْ ذلِكَ الطَّعامِ، وَيَسْـعَوا في رَفْضِ تِلْكَ العاداتِ، لِأَنَّــه لاتوافق الشَّـرعَ إِلاَّ نــادِراً).. واتە ئیحتیات و وەرع و خۆپارێزی لە حــەرام خۆری لەم کاتەدا ئەوەیە کە مرۆڤ هەوڵ بدات لەم نانەش نەخــوات کە لــە ماڵانەوە دێت بۆ ئەو پرســەیە، وە خەڵکی هەوڵ بدەن کە ئەم دەســتوورو بــاوەش نەهێڵن، چونکە بە دەگمەن نەبێ لەگەڵ شەرعدا ناگونجێ..

خاڵی سێیەم: نابێ شوێنێکی دیاریکراو دابنرێ بۆ دانیشتنی تەعزیە..

لە مەجموعی ئیمامی نەوەوی ج ٥ ص ٢٧٣ و توحفەی شێخی ئیبن حەجەردا هاتووە: ناپەسەندە خزمەکانی مردوو لە شوێنێك دابنیشن و کۆببنەوە تاکو خەڵکی تەعزیەیان لێ بکات و دڵیان بداتەوە، بەڵکو پێویستە لەسەر قەبرانەوە بڵاوەی لێ بکرێ و هەرکەس بۆ سەر ئیشوکاری خۆی بڕوات، جا هەرکەس لەهەر جێگایەك تووشی کەس و نزیکانی مردووەکە بوو، پرسەو تەعزیەیان لێ بکات..

پێشەواو سەر مەزهەبی ئێمەی کورد، ئیمامی شافیعی -رحمه الله- لە کتێبی خۆیدا -الأم- دەفەرموێ: (وأكره المآتم، وهيَ الجماعَة، وَإنْ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ بُكاءٌ، فَإنَّ ذلِكَ يُجَدِّدُ الحزنَ، وَيكلفُ المُؤنَةَ، مَعَ مامَضَى فيهِ منَ الأثَر). (كِتاب الأُم، الإمام الشافعي ج ١ ص ٢٤٨).

واتە: ماتەم گیریم بە لاوە ناپەسەندو مەکروهە. ئەوەی بە کۆمەڵ بۆ دانیشی، چونکە ئەگەر چی گریانیشیان نەبێ، بێگومان پەژارەو خەفەت تازە دەکاتەوەو دەبێتە ئەرك بۆ دابینکردنی خۆراك. لەگەڵ ئەوەی لە ئەسەریشدا بە ناپەسەندو مەکروهـ ناوبراوە، مەبەست لەو ئەسەرەی ئیمامی شافیعی باسی دەکات، وتەکەی هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) (جەریری کوڕی عەبدوڵلای بەجەلی)یە. کە لە پێشەوە باسمان کرد..

بەڵام ئەوەش هەیە کە: (وَذَهَبَ المُتَقَدِّمُونَ مِنَ الأَحْنافِ: إلى أنَّهُ لابَأسَ بالجلُوسِ في غَيْرِ المَسْجدِ -لِلرِّجالِ دُونَ النِّساءِ- ثَلاثَةَ أيَّامٍ لِلتَّعْزِيَةِ، مِنْ غَيْرِ إرْتِكابِ المَحْظُورِ)..

واتە: هەندێ لە پێشینانی مەزهەبی حەنەفی وای بۆ دەچن کە: زەرەری نییە دانیشتنی کەسوکاری مردوو لە جێگایەکی دیاریکراودا -بە مەرجێ مزگەوت نەبێ- بۆ ماوەی ســێ ڕۆژ بۆ ئەوەی خەڵکی بێن بۆ پرسەکەیان، بەڵام تەنها بۆ پیاوان نەك بۆ ژنان، بەڵام دەبێ خۆ بپارێزن کە لەو دانیشتنەداو بە هۆیەوە تووشی ئەو شتانە نەبن کە شەرع نەهی لێ کردووە، وەکو نانخواردن و قورئان خویندنی بە پارەو شەوو ڕۆژ بێ ئیسراحەتی و لە ڕوودامان..

## سەرچاوەکان:


١-قورئانی پیرۆز.

٢-صحيح قصص الرّسول (ﷺ) سعْد يوسف أبو عزيز ج١ ص ٣٩٩، ص ٦٩١، ص ٣٠٠.

٣ صحيح وصايا الرّسول . سعد يوسف أبو عزيز ج١ ص ٦٩٠.

٤-رياضُ الصّالحين، الإمام النَوَوي، و: نوري فارس حمه خان، ب١ ل ٦١.

٥-روناكـى رَبُّ العالَمين. رونكردنەوەی مِنهاجُ الطّالبــين، عبدالله عَبْدُ العَزيز هەرتەلی ب ٢ ل ١٤٨ ل ١٦٧.

٦-أَحكام الجَنائِز، محمد حَسّان، ص ٢٦٦.

٧-فِقْهُ السُّنَة - السَّيد سابق، ج١ ص ٥٠٨ ص ٥٦٤.

٨-جَواهِر الفتاوى، ملا عبدالكريم مدرس، ج١ ص ١٧٧.

٩-أساسيات الثُقافة الإسلاميَة، الصادِق بن عبدالرحمن الغرياني، ص ٤٧٥.

# بەشی دووەم

الحَمْـدُ للهِ رَبِّ العالَـمين والصَّلاة والسَّـلام عَلى سَـيِدِنا مُحَمَّـد وَعَلى آلِهِ وصَحْبِهِ أَجْمَعين

ئیمانــداران: مردن کە دۆســـت و ئازیزو خۆشەویســـتان لە یەك دەکات، بە ڕاســـتی نارەحەتەو بە موصیبــەت ناوبراوە لە قورئاندا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَأَصابَتْكُمْ مُصيبَةُ الْمَوتِ﴾ المائدة: ١٠٦

بەڵێ مردن کە هات خۆشیەکان لەناو دەبات، هەر ئەو ماڵەی یەك خولەك پێش ئەوە پڕ بوو لە پێکەنین و قســەی خۆش بە مردنی کەســێك تێی دا ئەبێ بە شــیوەن و گریان. ئەو مناڵە چاوگەشــەی کە نازی دەکرد، بە مردنی باوکی یان دایکی، هەســـت بە چ بێنازی و غەریبییەکــی خــۆی دەکات. ئەو ژن و مێــردەی کە هەریەکەیان بۆ ئەوی تر قەڵا بوو، بە مردنی هاوســەری هەست دەکات کەوتۆتە دەشــتێکی چۆڵ. ئەو باوکەی بە سەیرکردنی ڕۆڵەکەی چاوی ڕوون دەبــۆوە کە قورئان دەفەرموێ ﴿قُرَّةُ عَيْنَ﴾ ســۆمای چاوەکەی، چاو ڕۆشــن کەرەوەی بە مردنی مناڵەکەی، ئەو ڕووناکی چاوەی نامێنێ. دایك جەرگی دەســووتێ، پارچەیە لە جگــەری لێ دەبێتەوە، بەبێ

بەنج و نەشتەرگەری!! بەڵێ بە ڕاستی جوانترین دەربڕین دەربارەی مردن بریتییە لە فەرموودەکەی رسول الله (ﷺ) کە فەرمووی (أَكْثِروا مِنْ ذِكْرِ هاذِمِ اللَّذات).. بەڵێ بە ڕاستی مردن هەموو خۆشیەکان لەناو دەبات. مردن ئەوەندە کاریگەرە، کە کاتێ خوای گەورە باسی یەکێ لە پێغەمبەرە پایە بەرزەکانمان بۆ دەکات (یەعقوب) پێغەمبەر، ئەو یەعقوبەی کە خۆی پێغەمبەرە، باوکیشی کە (ئیسحاق)ە ئەویش پێغەمبەرە، باپیرەشی کە (ابراهیم)ە ئەویش پێغەمبەرە، مامەشی (ئیسماعیل)ە هەر پێغەمبەرە، کوڕەکەشی کە (یوسف)ە ئەویش پێغەمبەری خوایە.

بزانە ئەم (یەعقوب)ە پێغەمبەری خوایە چەند خاوەن ڕێزە لای خوای گەورە. پێغەمبەران لە هەموو کەس زیاتر متمانەو سیقەیان بە خوا هەیە، هیچ کات بە دڵ و خەیاڵیشیان ڕەخنەیەکیان لە کاری خوا نەگرتووە، پێغەمبەران مەعصومن، بەڵام منداڵ ئەوەندە شیرینە لە دڵی دایك و باوکیدا، کاتێ کە یوسف لە لایەن براکانیەوە دەخرێتە بیرەوەو ئێوارە کە دەگەڕێنەوە بۆ لای باوکیان، بە درۆ دەست دەکەن بە هاوارو فرمێسکڕشتن و دەڵێن: یوسف گورگ خواردی! کە قورئان بە درێژی بۆی باس کردووین. پاش چەند ساڵ کە (بنیامین)یش برا گچکەی یوسف بوو گەورە دەبێ و یوسف دەبێتە وەزیری دارایی میصرو بە بەرنامەیەکی نەخشەبۆکێشراو بنیامین لای خۆی گل دەداتەوە، کاتێ کە براکانی هاتنەوەو ئەم هەواڵەشیان بۆ باوکیان

(یەعقوب پێغەمبەر) گێڕایەوە، حەزرەتی یەعوقب کە ئەم هەواڵەی بیست هەموو لاشەی سارد بۆوە.

قورئان ئەو ساتەی ناو ماڵی حەزرەتی یەعقوب تۆمار دەکات، کە حەزرەتی یەعوب فەرمووی: ﴿یأَسَفی عَلی یُوسُفَ وابیَضَتْ عَیناهُ مِنَ الحُزنِ فَهُوَ کَظیم﴾ یوسف ٨٤.

واتە: کاتێ کە کوڕەکانی یەعقوب پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێ) هاتنەوە بۆ لای باوکیان و هەواڵی بنیامینیان پێ ڕاگەیاند، ئەوسا چووە کەنارێکەوەو لێیان دوورکەوتەوەو (بە دەم هەناسەی ساردو ئەسرینەوە) فەرمووی: ئەی داخم بۆ یوسفی نازدار، لە دڵم دەرناچێ یوسفی جوان، خاس و خواناسم. ئەوەندە گریاو فرمێسکی هەڵوەراند، چاوەکانی سپی هەڵگەڕان و ئاوی سپی تێزاو بینینی نەما لە داخ و خەفەت و ئێشدا، هەر خەم و پەژارەی خۆی دەخوارد.

بەڵێ، ئازاری دوورکەوتنەوەو دابڕان لە خۆشەویستان، بە تایبەت جگەرگۆشە بۆ دایك و باوکی، ئەوەندە بەهێزە، کە پێغەمبەرێکی وەکو یەعقوب، وا لێ دەکات، دوای ئەو هەموو ساڵە، کە هەواڵی گیرانی بنیامینی لە لایەن عەزیزی میصرەوە پێ دەگات، برینی کۆنی یوسف دەکولێتەوەو وشەی ﴿یا أسَفی﴾ ئەی هاوار، ئەی بە داخەوە، ئەی حەیف بۆ یوسفی جوانم، بە دەمیا دێت، بۆیە مردن و دابڕان لە خۆشەویستان هەرگیز برینەکەی و ئازارەکەی ساڕێژ نابێ. چەند جار بینیومانە کەسێك کوڕێك، کچێك، برایەك، خوشکێکی زۆر چاك

و گەنجی مردووە، دوای چەند ساڵ، کاتێ کەسێکی تر، منداڵێکی براو خوشکێکی هاوتەمەنی مردووەکەی ئەمی لێ دەمرێ و پەشێوحاڵەو دەگری، یەکسەر برینی دەکولێتەوەو خۆی بۆ ناگیرێ و وا ئەزانێ ئێستا مردووەکەی لێ مردووە!! هەروەکو حەزرەتی یەعقوب وای لێ بەسەر هات، دوای ئەو هەموو ساڵە چۆن بۆ یوسفی جوانی دەگری و ئەم دوورییە ئەوەندە کاری لێ دەکات کە چاوەکانی لە دەست دەدات ﴿وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ﴾. بەڵێ زۆر کەسمان بینی لە پیاوو لە ژن، لە ئەوپەڕی گەنجی و جوانی و لەشساغیدا بوون، لە ئەوپەڕی کەیفسازی و قسەخۆشیدا بوون، بەڵام کاتێ منداڵێکیان مرد، جەرگ سووتاو بوون، هەموو ژیانیان سەدو هەشتا پلە پێچەوانە بۆوەو بە ماوەیەکی کەم پیری و نەخۆشی و لاوازیان لێ دەرکەوت.

با لە ماڵی یەعقوب پێغەمبەرەوە بگوازینەوە بۆ ماڵی سەرداری پێغەمبەران محەمەدی مصطەفا (ﷺ) پاڵەوانی ناو هەموو پاڵەوانان، کە خۆڕاگرتر بوو بەرامبەر ناڕەحەتییەکانی ژیان لە بناغەی کێوان، لە دارخورمای بیابان، چونکە بەرگری پەیدا کردبوو بەرامبەر ئازارو ناڕەحەتییەکانی ژیان، چونکە هەموو ژیانی هەتیوی و بێنازی و دوور لە سۆزی باوك و دایك و باپیر بردە سەر، زۆربەی ژیانی بە دەربەدەری و ڕەنج و ماندووبوون بردە سەر، کەچی لەگەڵ ئەم هەموو ناڕەحەتی بینینەدا، کە مەرگی دەیان خۆشەویستی خۆی بینیبوو.

بە منالی یەکەم شــت هەســتی پێ کرد دابڕانی بوو لە باوکی کە زانــی پێش لە دایك بوونی باوکــی مردووە! بە چاوی خۆی مەرگی دایکی خۆشەویست و هەموو کەسی بینی لە کاتێکا تەمەنی (٦) ساڵان بوو. بە چاوی خۆی مەرگی باپیری بینی کە لە دوای باوك و دایکی نازی هەڵگرتبوو، مەرگی حەمزەی مامی بینی کە چۆن شــەهیدیان کردبوو، لاشەشــیان شێواندبوو، مەرگی ئەو هەموو صەحابە ئازیزو خۆشەویســتانەی خۆی بینی بوو، کە بــە هەموویان ئازار بە ناخی گەیشتبوو.

دەی ئەم کەسەی کە ئاوا لەگەڵ مردنی ئازیزان و خۆشەویستانی ڕاهاتووە، زۆر خۆڕاگرترە لە کەسێك کە لە ژیانیا تووشی ئەم خەمە گەورانــە نەبووە، بەڵام ئــەم پێغەمبەرە بەهێزە خۆڕاگرە، کاتێ کە ئیبراهیمی کوڕی وەفاتی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) تەمەنی لە (٦٠) ساڵی تێپەڕی کردبوو، دەســتی کرد بە گریان، ئیبراهیمی جگەرگۆشــەی لەســەر باوەشی گیانی ســپاردو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە مردوویی گووشی بە خۆیەوەو بارانی سۆزو ئەوینی بەسەردا ڕشت و گریا، زۆر گریا، ئەوەندەی فرمێســك بۆ ڕشــت، کە گەیشتە ڕادەی سەرنجدان و تێڕامانــی هاووڵاتیانی. ئەوە بــوو (عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف) فەرمووی: (أَتَبكي، أَوَلَمْ تَكُنْ نَهَيتَ عَنِ البُكاءِ؟!) ئەوە چییە دەگری ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەی تۆ ڕێگریت نەدەکرد لەوەی کە لەســەر مردوو بگرین؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لا، وَلكِنْ نَهَيتُ عَنْ صَوْتَينِ

أَحْمَقَيْنِ فاجِرَيـِن، صَوْتُ عِنْدَ مُصيبَةٍ، خَمْشُ وُجوهِ، وَشَـق جُيُوب، ورِنَةُ شَيْطان).

واتــه: نەخێر مــن ڕێگریم نەکردوون لە گریان لەســەر مردوو، بەڵکــو من نەهیــم کردووە لە دوو دەنگی ناســازی نالەباری خراپ و ناشــەرعی، دەنگێکیان لە کاتی بەڵاو موصیبەتدا لە کاتی مردنی ئازیزو خۆشەویستاندا، کە بریتییە لە دەم و چاو ڕنینەوەو سنگ و یەخــە دادڕین و لاواندنەوەی مردوو بە دەنگی بەرزو پیاهەڵگوتنی مردووەکە بە شــێوەی شــیعرو لاوك و لاواندنەوە، من ڕێگریم لەم جۆرە دەنگ و ڕەفتارە لێ کردوون کە بە سەر مردوودا بیکەن.

پاشان پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ) فەرمووی: بە ڕاستی مردنی ئیبراهیمــی کوڕم جەرگی بڕیم، خۆم بــۆ ناگیرێ، ناخم دەکوڵێ و چــاوم هۆن هۆن فرمێســك دەبارێنــێ، ئەمجا فەرمــووی: (إِنَّ العَيْنَ تَدْمَعْ، وَالقَلْـبَ يَحْزن، وَلانَقُولُ إِلاَّ مايَرْضَى رَبُّنا، وَإِنّــا بِفِراقِكَ يا إِبْراهيمُ لَمَحْزُونُون). رواهُ البُخاري: (١٣٠٣) وَمُسْلِم: (٢٣١٥).

واتە: بە ڕاســتی چاو فرمێســك دەڕێژێ و دڵ مەحزون و خەمبار دەبــێ، بەڵام شــتێ ناڵێین کە پەروەردگارمان پێــی ڕازی نەبێت. بە ڕاســتی ئەی ئیبراهیم بە مەرگی تۆو بەوەی جێت هێشتین، گڕوکاڵ و یــاری و گەمە خۆشــەکانت لە ناو ماڵمــان بڕاو ماڵمان بە مردن و ڕۆیشــتنی تۆ چۆڵی پێوە دیارە، بە ڕاســتی بەم کۆچەت مەحزون و خەمبارین! بەڵێ مردن ئاوا دڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دێنێتە کوڵ.

لەگەڵما بن ئیمانداران، هەر لە ناو ماڵ و بنەماڵەو ئال و بەیتی پێغەمبەردابن (ﷺ) زەینەبەی کچی پێغەمبەر، مناڵێکی هەبوو، ئەم مناڵە زۆر نەخۆش بوو، لە کاتی سەرەمەرگدا بوو، زەینەبە کەسێکی بانـــگ کردو ناردی بۆ خزمەتی پێغەمبـــەر (ﷺ) وتی: توخوا کاکە گیان خێرا بڕۆ بۆ لای باوکم و پێی بڵێ: (إِنَّ إِبْنِي قَدْ احْتُضِرَ، فَاشْهَدْنا فَأَرْسَلَ يُقْرِيءُ السَّلامَ، وَيَقُول: إِنَّ لِلهِ ما أَخَذْ، وَلَهُ ما أَعْطَى وَكُلُّ شَيءٍ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فالْتَصْبِرْ وَالْتَحْتَسِبْ).

واتـــە: بە باوکم بڵێ، وا کوڕەکـــەم بە ڕووحەوەیەو خەریکە گیان دەدات، با بێت لە لامان بێت. کاتێ کە کابرا چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) کە دیـــارە لەو کاتەدا خەریکی ئیش و کاری موســـڵمانان بـــووە، (وَاللهُ أَعْلَـم) وای زانیـــوە کە کوڕی کچەکەی تەنها نەخۆشـــەو دایکی لە پەرۆشـــیدا بۆی وا دەزانێ کە نەخۆشـــی سەرەمەرگە، بۆیە دەســـتبەجێ نەهات بۆ لای و بەو کەســـەی کە هەواڵەکەی هێنابوو، فەرمووی: بڕۆ بۆ لای کچەکەم و سەلامی لێ بکەو پێی بڵێ: هەرچی خوای گەورە وەری بگرێتەوە هی خۆیەتی و ئەوەی بیبەخشـــێ هەر هی خۆیەتی، هەموو شـــتێکیش لە لای خـــوا کاتی دیاریکراوی خۆی هەیـــەو تەمـــەن و ژیان و کاتی مردن دیاری کراوە، بە کچەم بڵێ، با ئارام بگرێ و خۆڕاگر بێ و چاوەڕێی پاداشتی خوا بێ.

بەڵێ ئەم کەسە چووەوە بۆ لای زەینەبەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمایشـــتەکەی پێغەمبەری خوای پێ ڕاگەیاند، بەڵام زەینەبە کە

سـەیری کوڕە جگەرگۆشەکەی دەکرد وا خەریکە ڕووحی دەردەچێ و هەنسـکی گیاندانیەتی، ئاگری جـەرگ زیاتر تینی بۆ هێنا، بۆیە هەمان کەسی ناردەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و فەرمووی: (تُقْسِمُ عَلَيْـهِ لَيَأْتِيَنَّها). توخوا بــە باوکم بڵێن خێرا بگاتە لامان. پێغەمبەر خــوا (ﷺ) زانــی کە بە ڕاســتی کچەزاکەی هیلاکــەو نزیکی مردن بۆتەوە، بۆیە یەکسەر لە مەجلیسەکە هەڵساو لە خزمەتیدا سەعدی کــوڕی عوبــادەو موعازی کــوڕی جەبەل و ئوبەی کــوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابیت و کۆمەڵێ پیاوی تر هەڵســان و شوێنی کەوتن. «لێرەوە ئەوە وەردەگرین کە ئەگەر لەگەڵ کەسێك بووی و هەواڵیان بۆ هێنا وا کەســێکی لە سـەرەمەرگدایە، یان مردووە، ئەوا بە جێی مەهێڵەو لەگەڵیا بڕۆ بۆ ئەو ماڵە کە مردووەکەی لێیە».. بەڵێ کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشــتە ماڵی زەینەبەی کچی، زەینەبە خان منداڵەکەی هێناو خســتیە باوەشــی پێغەمبەری خواوە، منداڵەکەشی هەنسـکی ڕوحدەرچوونی بوو، لە باوەشــی پێغەمبــەردا (ﷺ)، ئەو منداڵە کۆرپــە جوانە، ڕوحی دەرچوو. (فَفاضَتْ عَيْنــاهُ). پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی پڕ بوو لە فرمێســك، ئەمجارەیش زۆر فرمێســکی بەخوڕ بە چــاوی موبارەکیدا هاتە خوارەوە. «بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا فرمێسکت بۆ کێ نەڕشت، جا خەمی کێت نەخوارد، جا بــۆ چ دڵبەخەمێك نەکولای، ئەی (رَؤوفٌ رَحيم)، ئەی بەبەزیی و سۆز بۆ هەموو ئوممەت».

کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پەرۆشی زۆریدا بۆ ئەو منالە بچکۆلـەی کچەزای، زۆر خەمباری و گریانی پێوە دیار بوو. سـەعد عەرزی کرد: (یارَسـولَ اللهِ ماهـذا؟!) ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم گریانە چییە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هذهِ رَحْمَةٌ جَعَلَها اللهُ تَعالى في قُلوبِ عِبادِهِ، وَفي رِوايَةٍ: في قُلوبِ مَنْ شـاءَ مِنْ عِبادِهِ، وَإنَّما يَرْحَمُ اللهُ مِنْ عِبادِهِ الرُّحَماءَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، بُخاري: ١٢٨٤..

واتە: ئەم گریانە لەسەر ئەم کۆرپە جوانە مردووە، ئەوە ڕەحمەتەو خوای گەورە خسـتوویەتیە ناو دڵـی بەندەکانییەوە. لە ڕیوایەتێکدا، ناو دڵی هەرکەس ئارەزوو بکات و شایستە بێ لە ناو بەندەکانیدا، وە بە دڵنیاییەوە خوای گەورە ڕەحم بەو کەسە دەکات لەناو بەندەکانیدا کە ڕەحم و بەزەیی و سۆزی زۆر بێ و دڵی نەرم بێ و خاوەن بەزەیی بـێ.. بەڵێ لەم باسـەوە تـێ دەگەین کە خوای پـەروەردگار نایەوێ مـرۆڤ بە نـاوی ئەوەی کە خۆڕاگـرەو ورەبەرزەو بـە هیمەتە، لە کاتی مردنی خۆشەویستانیدا، ئەگەر کۆرپەیەکی بچکۆلەش بێ، هیچ بەسـەر خۆی نەهێنێ و فرمێسـکێك لە چاوی نەیەت و وەکو بەردو دار وابێ و نەهەژێ و نەشڵەژێ و هیچ کاردانەوەیەکی ئەو ناڕەحەتیە لە سـەری نەبینرێ. نەخێر ئەوە لەسـیفاتی مرۆڤی موسڵمان نییە، بەڵکو عاتیفەو سـۆزو بەزەیی و بەڕەحمی نیشانەی ئەوەیە کە دڵت نیشانەی نەرم نیانەو بەزەییت هەیە. هەرکات بۆ مردوو سۆزت جوڵا یـان گوێت لە گریانی کەسـێك بوو کە بۆ خۆشەویسـتێکی مردووی

دەگــری. تۆش خۆت بۆ نەگیــراو گریای، ئەوە دڵت خۆش بێ بەوەی کە إنشاءَالله خوا ڕەحمت پێ دەکات..

گــوێ بگرن بۆ ســەروەرو ســالارمان محەمــەدی مصطفا (ﷺ) دەفەرمــوێ: (إِنَّ المُؤمِنَ مِــنْ أَهْلِ الإيمــانِ بِمَنْزِلَةِ الرَّأسِ مِنَ الجَسَــدِ، يَأْلَمُ المُؤمِنُ لِأَهْلِ الإيمانِ، كَما يَأْلَمُ الجَسَــدُ لِما في الرَّأسِ) رَواهُ أَحمد في المُسَــند (٥/ ٣٤٠)، وَالصَّحيحَة لِلأَلْباني رَقَم: ١١٣٧.

واتە: بە ڕاستی ئیماندار لەناو کۆمەڵی ئیمانداراندا وەکو سەر وایە لە ناو جەستەدا، هەر بۆیە ئیماندار بە پەرۆشە بۆ برایان و خوشکانی لە ئەهلی ئیمان، کاتێ تووشــی گرفت و ناڕەحەتییەك دەبن، هەروەکو جەستە تووشی ئازار دەبێت کاتێ کە سەر تووشی ئازارێك ببێ.

بەڵێ، نیشانەی ئیمانداری ئەوەیە کە بە خۆشی خەڵکی خۆشحاڵ دەبێ و بە دڵتەنگی و موصیبەت و ناڕەحەتیان توشــی دڵتەنگی و ئازار دەبێ. بەڵام ئەگەر کەســێك بە خەمــی کەس خەمبار نەبوو، لەســەر جەنازەو بە خاکسپاردنی براو خوشــکی موسڵمانیشی، لەو سەر قەبرانە کە بە ڕاستی مرۆڤ دەهەژێنێ، لەوێش خەمبار نەبوو، لەوێش هەر خەریکی قسەی دونیایی و پێکەنین بوو.

کاتێ خەڵکی بۆ مردووەکە دەگریان، ئەو معامەلەو کڕین و فرۆشتنی بە مۆبایلەکەی دەکردو زەردەخەنە دەیگرت، ئەوە پەنا بە خوا نیشانەی ئەوەیە ئەو دڵە مردووە چۆن ئەوە ڕەحم و بەزەیی بەرامبەر خەڵکی ناجوڵێ، ئاواش دەبێ بترسێ کە خوا ڕەحمی پێ نەکات!!

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: یەکێ لە سیمای کۆمەڵگای موسڵمان ئەوەیە کە لە کاتی ناخۆشی و ناڕەحەتیدا بە دەوری یەکەوە دەبن و دڵی یەکتر دەدەنەوەو دوعای خێر بۆ یەکتر دەکەن و دوعای لێخۆشبوون و شادبوون بە بەهەشت بۆ مردووەکەیان دەکەن، کە ئەمەش پێی دەوترێت تەعزیەو پرسە.

کەواتە: تەعزیەو دڵدانەوەی خاوەن مردوو، وە دوعای خێرکردن بۆ مردووەکە بە مەرجێ بە پێی شەرع بێ، زۆر کارێکی باشەو پاداشتی گەورەی بۆ هەیە.

پێغەمبەری سەرەوەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: (مامِنْ مُؤمِنٍ يُعَزِّي أخاهُ بِمُصيبَةٍ، إلاَّ كَساهُ اللهُ سُبْحانَهُ مِنْ حُلَلِ الكَرامَةِ يَوْمَ القيامَةِ) صَحيح سُنن إبن ماجَة: ١٣١١.

بەڕێزان: ئێمە لە وڵاتی موسڵمانی خۆماندا، لەناو میللەتی بەڕێزو دڵپڕ بەزەیی خۆماندا لەگەڵ ئەم دڵدانەوەو پرسە لەیەك کردنەو بە دەم یەکەوە بوونە لە کاتی مردنی ئازیزێکماندا ڕاهاتووین و لە لامان بۆتە شتێکی ئاسایی، بەڵام ئەوانەی لە ئەوروپاو ئەمریکاو ئەو وڵاتانە دەژین کە بە پێی ئاینی ئیسلام ڕەفتار ناکەن بە تایبەت لە مەسەلەی کاتی مردن و بە خاك سپاردن، ئەوانە کاتێ کە ئەم ڕێزو بەدەمەوەبوونەی نێوان موسڵمانان دەبینن، بە لایانەوە زۆر گەورەییە کە موسڵمانان ئاوا لە کاتی ناڕەحەتی و موصیبەتدا بە دەوری یەکترەوەن و ناڕەحەتی هەریەکەیان بە هی هەموویان

دەزانن.. یەكێ لەو كەسانەی كە ئەم شاهیدیە بە دەمی خۆی دەدات و ئێستا -كاتی پێشكەشكردنی ئەم وتارە- لە كوردستانی ئازیزو ئازادمانەو لە هەڵەبجەی تازە نیشتەجێیەو گۆڤاری (هۆنیا، ژمارە ٢١، ل١٣) چاوپێكەوتنێكی لەگەڵ كردووە بریتییە لە ئافرەتێكی بەریتانی، كە مێردەكەی خەڵكی هەڵەبجەی تازەیەو ناوی (محمد، ق) لە بەریتانیا ئیقامەی هەیە، ژنەكەی ناوی (كالی لویس)ەو مواليدی (١٩٨٦) لە شاری (لاوس تۆفت) لە بەریتانیا دەژی، ئەم ئافرەتە ئینگلیزە بەم شێوەیە باسی خۆی دەكات و دەڵێ: پێشتر مەسیحی بووم، كاتێ ئەم كوڕە كوردە (محمد)م ناسی و بڕیارم دا شووی پێ بكەم، دایك و باوك و مناڵە مەسیحییەكەم ناڕازی بوون، بەڵام من بڕیاری خۆم داو تەفسیرو مانای قورئان و چەند كتێبێكم لەسەر ئیسلام بە وەرگێڕدراوی زمانی ئینگلیزی خوێندەوە، ئەمجار زیاتر گەورەیی ئیسلامم بۆ دەركەوت و موسڵمان بووم و باوكم و دایكم و هەموو بنەماڵەكەم حاشایان لێ كردم و پەیوەندیم لەگەڵیان نەماوە! بەڵام من بڕیاری خۆمم داوەو بە لامەوە گرنگ نەبوو، ئەم ئافرەتە دەڵێ: ئێستا پەیوەندیم تەنها لەگەڵ نەنكم و باپیرم ماوە، چونكە دوای موسڵمانبوونم سەردانی نەنكمم كردو ماڵم بۆ پاك كردەوەو خزمەتم كرد، زۆری بە لاوە سەیر بوو، چونكە هیچ كات دایكم هاوكاری نەكردبوو، كاتێ لێی پرسیم چۆنە ئاوا هاتووی ڕێزم دەگری و یارمەتیم دەدەی؟! وتم: ئەوە ئیسلامەكەم فێری كردووم

و فەرمانی پێ کردووم کە ئاوا ڕێز لە کەسوکارو خەڵکی بە گشتی بگرم و هاوکارییان بکەم و یارمەتیان بدەم.. دەڵێ: نەنکم جلوبەرگە بالاپۆشەکەم و سەرپۆشەکەمی زۆر بەلاوە جوان بوو، داوای لێ کردم لەو جلوبەرگانەی بۆ بکرم، ئێستاش کە لە کوردستانم تەلەفۆنم بۆ دەکات و هەواڵم دەپرسێ..

ئەو ژنە دەڵێ: هەموو کەسوکارو هاوڕێکانم لە شاری (لاوس تۆفت) پەیوەندییان لەگەڵ پچڕین و ئازاریان دەدایـن، بۆیە لەگەڵ محەمەدی هاوسەرم هاتینە شاری (برانت فۆرت)، کە موسڵمانی زۆری لێیە.. پێشتر لە شاری (لاوس تۆفت) تەنها من و ژنێکی عەرەب حیجاب لەبەر بووین، بۆیە هەرچی دەیبینین تەماشای دەکردین!!

لە شاری (برات فۆرت) لە ڕێگەی کەناڵێکی ئیسلامی ئینگلیزییەوە ئاگاداری مانگی ڕەمەزان دەبووین، لە بەریتانیا دەچووم بۆ نوێژی تەراویح و شەوانی قەدر دادەنیشتم.

(کالی) دەڵێ: هەرچەندە محەمەدی هاوسەرم بۆی باس کردم کە لە کوردستان کارەبا وەکو پێویست نییە، پارك و باخچە زۆر دەگمەنە، تەپوتۆزو جادەو بان نارێك و پێکە، ئاو کەمە، بەلام من حەزم کرد کوردستان بە چاوی خۆم ببینم، بۆیە هاتینەوە بۆ کوردستان و ئێستاش بڕیارم داوە نەڕۆینەوە، ئەم ژیانە سادەی کوردستانم زۆر لە بەریتانیا پێ خۆشترە.

کاتێ ڕۆژنامەنووسەکەی گۆڤاری (هۆنیا) پرسیاری لێ دەکات، چ

شـــتێکی کوردســـتان زۆر خۆشـــحاڵت دەکات و چی دلگرانت دەکات؟ لـــە وەڵامدا (کالی) دەڵێ: بەوە دڵخۆشـــم کە لێـــرە ئەو هەموو ڕێزو حورمەتـــە هەیـــە، زۆر دڵم خـــۆش بوو کە هاتینـــەوە، ئەو خزم و دۆســـتەی محەمەد هاتن بـــۆ بەخێرهاتنەوەمان، بـــە تایبەتی زۆر ڕێزیـــان لە من گرت، خەســـوو و خەزوورم بـــە دایك و باوکی خۆم دەزانم، چونکە زۆر ڕێزم لێ دەگرن.

بە ڕاســـتی بە لامەوە ســـەیر بوو کـــە هاتمە کوردســـتان بینیم کاتێ کەسێ نەخۆش دەکەوێت، ئەم هەموو خەڵکە سەردانی دەکەن، کەســـێك دەمرێ چۆن ئەو گەڕەکە دەخرۆشێ و ئەو هەموو خەڵکە کۆدەبنەوە، هیچ کات لە ژیانمدا مردووم نەبینیوە، بەڵام لەم چەند ڕۆژەدا منداڵێکـــم بینی کە مردبوو، چوومـــە تەعزیەکەیەوە زۆر بە لامەوە ســـەیر بوو کە ئەو هەموو خەڵکە چەند بە پەرۆشییەوە بۆ حورمەتی منداڵێکی مردوو، وە دڵدانەوەی دایك و باوکی کۆبوونەتەوە، بەڵام لە بەریتانیا لەو شـــتانە نییەو هەرکەس بۆ خۆیەتی و کەس گوێ بە کەس نادات و شارەوانی لاشەی مردووەکان دەنێژێت.

ئەمجا دەڵێ: ئەوەش کە لە کوردستاندا دڵناڕەحەتم دەکات ئەوەیە کە هەرچەندە سوپاس بۆ خوا پێش ئەوەی بێمە کوردستان موسڵمان بووم، ئەینا ئەگەر پێش موســـڵمانبوونم بهاتمایە کوردستان، ڕەنگە هەرگیز موســـڵمان نەبوومایە، بەڵام من ئێســـتا شـــانازی دەکەم بە دینەکەمەوە، چونکە لە خەڵکەوە نەمناسیوە! ڕۆژنامەنووسەکە لێی

دەپرسێ: بۆچی بە لاتەوە سەیرە موسڵمانیەتی ئێرە؟!! دەڵێ: ئاخر کاتێ کە لە بەریتانیا بووم و لەگەڵ محەمەدی هاوسەرم تەماشای کەناڵە کوردییە ئاسمانییەکانم دەکرد، دەمبینی هەر خەریکی گۆرانی و سەماکردن بوون، وام دەزانی لە کوردستان هەموو کەس گۆرانی بێژەو فەقیرو هەژار لە کوردستان نییە، لێرەش کە بە حیساب ئەو ژن و کچانە موسڵمانن، کەچی ئەو جلوبەرگەی کە ئیسلام لە ئافرەتی ئیمانداری قەدەغە کردووە، ئەوە لەبەر دەکەن و سەرو گەردنیان داناپۆشن!! کاتێ لە هەڵەبجەی تازە چوومە ئاهەنگی بووك گواستنەوەی خزمێك، بە لامەوە سەیر بوو، ئەو هەموو ئافرەتە موسڵمانە کە هیچی دەم و چاوی خۆی نەبوو، هەمووی بە میکیاژ داپۆشرابوو، دواتر کە چووینەوە ماڵ زۆرم پێ ناخۆش بوو، چونکە وام هەست دەکرد تووشی گوناھ بووبم!!

خوشکە (کالی) دەڵێ: بە داخەوە لە بەریتانیا خێزان لێك هەڵوەشاوەو کچ لە هەژدە ساڵ یان کەمتریش ماڵ بەجێ دێڵێ، ئەو حورمەت و خوازبێنی ئافرەتە بەو ڕێزەوەی لێرە هەیە لەوێ نییە، هیوادارم کچانی کورد پابەند بن بە جلوبەرگ و ئادابی ئیسلامییەوە.

بەڵێ (کالی) ئیستا ناوی خۆی ناوە عائیشە، بە ناوی دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە، بۆ ئەوەی ئەویش لەگەڵ هاوسەرەکەی (محەمەدو عائیشە) بن!

ئیماندارانــی بەڕێــز: بۆچی ئەمــەم بۆ جەنابتان بــاس کرد لە کاتێکدا ئێمە لەم وتارەدا باسی تەعزیە دەکەین؟! لەبەر ئەوە باسم کرد چونکە:

١-بە خوێندنەوەی ئەو بابەتە لەو گۆڤارەدا دڵخۆش بووم، ویســتم ئێوەی ئیمانداریش پێی دڵخۆش بن، چونکە بە هاتنی یەك کەس بۆ ناو ئاینی ئیسلام دڵمان شاد دەبێ و بە لاڕێبوونیشی دلگران دەبین.

٢-توخوا با قەدری ئیسلامەکەمان بزانین و ئاوا ئێمەش قوربانی لە پێناودا بدەین.

٣-خەڵکی دەرەوە ئاوا ڕێز لە ئیســلام دەگرن، کاتێ کە موسڵمان دەبن حەز دەکەن پێ بە پێی خۆشەویست هەنگاو هەڵبگرن، تەنانەت لە هەلگرتنی ناویشــیاندا، ئەوەتا کالی ناوی خۆی دەنێت عائیشــە، کەچی لە وڵاتی موسڵمانی ئێمە، کچی موسڵمان هەبووە ناوی عائیشە بووە، بە ناوەکەی خۆی ڕازی نەبووە. ڕەنگە بیگۆڕێ بە (کالی)!!

تەماشــا کەن ئەو ئافرەتە لە دوای موسڵمان بوونییەوە، یەك ڕۆژ بە سفوری نەمایەوەو لە ناو هەزارەها خەڵکی ئەو شارەی خۆیدا لە بەریتانیا، تاقــە حیجاب لەبەر بــوو، کەچی بە داخەوە لای ئێمە کچی موســڵمان لەگەڵ دایکی دەچێتە بازاڕ، دایکی عەبای پێوەیە کەچی کچەکەی دەڵێی لە (لەندەن)ەوە هاتووە!! هەرگیز نازانی ئەمە کچە موسڵمانە!

٤-بەختــەوەری بــە کارەبای فول و پارکی جــوان و پارەی زۆرو وڵاتی پێشکەوتووەوە نییە. بەختەوەری ڕاستەقینە وا لە سینەدایە،

لە دڵدایە، کە بە هۆی ئیمانی ڕاســت و دروســتەوە دەســت مرۆڤ دەکــەوێ. بەختەوەری ڕاســتەقینە لــە ڕێزو حورمــەت و بەزەیی بەیەکتردا هاتنەوە هەیە، کە ئەمەش لە ئیسلامی حەقدایە..

بەڵێ، یەکێ لە جوانیەکانی ئەم ئیســلامەیە کە موســڵمان وەکو ئەرکێکی موســڵمانیەتی لە ســەری بەشــداری خەم و مەحزونی و دڵتەنگــی براو خوشــکی موســڵمانی بێ و بە کــردەوە پێی بڵێ: وا مەزانــە بە تەنهــای، ئەوا من کە لە کاتی خۆشــی و ئاســاییدا بە یەکەوە پێ ئەکەنین لەگەڵتا بووم، وا لە کاتی تەنگانەو دڵتەنگیشدا هەر لەگەڵتم، ئامادەم کاتی خۆم، کاســپی خۆم، پشووی خۆم بە تۆ ببەخشــم و خەمەکــەت لەگەڵ هەلگرم. ئەمجا بە وشــەی جوان و قەناعەت پێ هێنەرو دوعای خێر هەوڵ بدەی ئارامی بکەیەوە، بەمە ئەجرو پاداشتێکی زۆرت دەست دەکەوێ. جا ئەم دڵدانەوەیە جاری وا هەیە مامۆســتایەکی ئاینی دەتوانێ بیکات، جاری وا هەیە گەنجێك، ژنێــك دەتوانێ ئەنجامی بــدات. با بچینە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە باسی ڕووداوێکی زەمانی پێش ئیسلاممان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: لەناو بەندی ئیســرائیلیەکاندا کابرایەکی شــەرعزان و خاوەن عیبادەتی زۆر هەبوو، بە کوردی خۆمان مەلایەکی شــارەزای ديندار بوو، ئەم مامۆستایە ژنێکی زۆر چاك و بە حورمەت و دیندارو بە خزمەتــی هەبوو، زۆر خزمەتی ئەم مامۆســتایەی دەکردو زۆر حورمەتی خزم و کەسوکاری دەگرت و زۆر میواندۆست بوو، سەری

ئەم مامۆستایەی لەناو خزم و دۆست و ناسیاوانیدا بەرزکردبۆوە، بە ڕاستی گەورەترین سەرمایەی ئەم پیاوە بوو، بەلاّم ڕۆژێکیان ئەو ژنە چاکە بە نەخۆشییەکی کتوپڕی کوشندە کۆچی دوایی کردو مرد! پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (فَحَزَنَ عَلَيْها حُزْناً شَديداً). ئەم مامۆستایە هەتا بڵێی پەرۆشی ئەم ژنەی بوو، لە ڕادەبەدەر بۆی مەحزوون و خەمبار بوو، بە ڕادەیەك بۆی پەرۆش بوو (حَتَّى أَغْلَقَ عَلى نَفْسِهِ باباً واحتَجَبَ مِنَ النَاسِ). دەرگای لەسەر خۆی داخست و تێکەلاّوی خەڵك نەدەبوو، وازی لە دەرس و دەورو ئامۆژگاری موسڵمانان هێنا (کە بە ڕاستی ئەمەش وەفاداری پیاوە بەرامبەر بە ژنەکەی، کە بە داخەوە لە ولاّتی ئێمە ئەگەر ژن بمرێ خەڵکی بە لایانەوە سەیرە ئەگەر هاوسەرەکەی بۆی بگری، یان گۆشەگیر ببێ و تاقەتی کەسابەت و ناو خەڵکی نەمێنێ).. پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسەکەمان بۆ تەواو دەکات و دەفەرموێ: (فَسَمِعَتْ بِهِ إمْرَأَةٌ). ژنێکی بە تەمەنی ڕێکوپێك کە شێرەژن بوو، زۆر داناو زانا بوو، دەنگوباسی ئەم زانایەو مردنی ژنەکەی و کاریگەری لەسەر ئەو زانایە بیست، کە خەڵکی دەیان گوت بە ڕاستی مامۆستا فلاّن کەسمان لەدەست چوو، چونکە لە دوای مردنی ژنەکەیەوە هیچ تواناو هێزێکی نەماوەو نایەتەوە ناو خەڵکی وەکو جاران! ئەم ژنە ڕێکوپێکە خەمخۆرەی موسڵمانان، هات بۆ لای ماڵی ئەم مامۆستا خەمبارە گۆشەگیرە بە ناوی ئەوەی کە پرسیارێکی شەرعی لە مامۆستا هەیە،

(فلَمْ يَأْذَنْ لَها) بەڵام مامۆستا ڕێگای چاوپێکەوتنی پێ نەدا، بەڵام ئەم ژنە بەردەرگای مامۆستای بەرنەداو بە دەرکەوانی مامۆستای گوت: پێی بڵێ من پرسیارێکی زۆر گرنگم هەیەو وەڵامی ئەو پرسیارە تەنها بەو وەڵام دەدرێتەوەو تایبەتە بەوەوە، ئەگەر وەڵامم نەداتەوە گوناهبار دەبێ و منیش لێرە ناڕۆم، دەرکەوانیش چووە خزمەت مامۆستاو ئەم پەیامەی ژنەکەی پێ گەیاند، مامۆستا بە ناچاری فەرمووی ڕێگای پێ بدەن بابێ بە کورتی پرسیارەکەی بکات، بەم شێوەیە ئەم ژنە زیرەکە بەم پلانە ژیرانە توانی بگاتە لای مامۆستاو پرسیارەکەی خۆی کرد کە ئەمە بوو: جەنابی مامۆستا من لە ژنی دراوسێیەکەمان پارچە خشڵێکی ئاڵتوونم خواست کە بۆ ماوەیەك بە ئەمانەت لام بێ، ئەویش پێی دام و ئەوە ماوەیەکی باشە لە لامەو خۆم پێ ڕازاندۆتەوەو لێی سوودمەند بووم، بەڵام ئێستا ئەو ماڵە دراوسێیەمان داوای ئاڵتونەکەیان دەکەنەوە، ئایا بیاندەمەوە؟! مامۆستا کە فەرمووی: بەڵێ، بە ڕاستی دەبێ بە دوودڵی و دواکەوتن بیدەیتەوە. ژنەکە وتی: ئاخر جەنابی مامۆستا ئەوە ماوەیەکی زۆرە لەلای من ماوەتەوەو بەو خشڵە جوانە دگیرە ئالوودە بووم و حەزناکەم بیدەمەوە!! مامۆستاکە فەرمووی دەی هەر ئەوەی کە دەڵێی ماوەیەکی زۆرە لەلام ماوەتەوە، ئەوە شایستەتر دەبێ کە ئەو خشڵەیان بدەیتەوە، چونکە ئەو ئاڵتوونە لەلای تۆ بۆ ماوەیەك بە ئەمانەت دراوەو وا ماوەکەش تەواو بووەو خۆ بۆیەیان نەداویتێ کە

هەتــا هەتایە هەر لە لات بێ، لەبەر ئەوە بەبێ دڵتەنگی و دووڕدڵی پارچە خشــڵەکە بووەوە بە خاوەنی، لێرەدا ئەم ژنە ژیرە وتی: (أي يَرْحَمُكَ الله، أَفَتَأْسَفُ ما أعارَكَ ثُمَّ أَخَذَهُ مِنْكَ، وَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْكَ؟!).

واتــە: ئــەی ڕەحمەتی خوات لێ بێ مامۆســتا، کە ئــاوا فتوا بۆ مــن ئەدەی ئــەی بۆچی بۆ خــۆت ئەوەنــدە دلگرانی بــەوەی کە ئەمانەتێکــت لا دانرابــوو، کەچی کە بردیانەوە بۆی بە پەرۆشــی، لــە کاتێکــدا خاوەنەکەی لایەقترو شایســتەترە بــەوەی کە لە لای بــێ؟! (فَأَبْصَرَ ماكانَ فيهِ مِنَ الخَطَـأ، وَنَفَعَهُ اللهُ بِقَوْلِها). پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ئەم مامۆســتایە یەکســەر تێ گەیشت کە ئەم ژنە وریاو ژیرە مەبەستی چییەو بەرچاوی ڕۆشن بۆوەو لە هەڵەی خۆی حاڵی بوو، وە زۆر سوودمەند بوو لە قسە جوان و نموونە ڕاستەقینەکانی ئەم ژنە ژیرەو ئیتر هاتەوە ناو خەڵکی و دەستی کردەوە بە وانەو ئامۆژگاری.

بەڵێ ئەم دڵدانەوەو ئامۆژگاریە خێرە بۆ ئەو کەسە کە مردوویەکی ئازیزی لەدەست داوە، هێندە گەورەو بەنرخ بوو، کە شایستەی ئەوە بێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئومەتی بگێڕێتەوە، ئەم فەرموودەیەش لە (المُوطَّأ، الإمام مالِك ج١ ص ٢٣٧)دا هاتووە..

بەڕێزان: دڵدانەوەی خاوەن مردوو پرسەکردنی ئەوەندە گەورەیە کــە تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دڵدانەوەی بۆ منالی خەمباریش کردووەو بە زمانی منالەکەو ڕادەی تێگەیشــتنی دڵخۆشــی داوەتەوەو

مەحزونیەکەی لابردووە، بۆ نموونە: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشـریفی بردە مەدینە، خەڵکی موسـڵمانی مەدینە بۆ خۆشـحاڵی دەربڕیـن و بەخێرهاتنـی دەچوونـە ماڵی پێغەمبـەر (ﷺ) کە لە خانووەکـەی (ئەبو ئەیوبی ئەنصاری)دا بـوو، هەریەکەی چی ببوایە وەکو دەست و دیاری لەگەڵ خۆی بۆ ماڵی پێغەمبەری خوای دەبرد.

ئەوە بوو ڕۆژێکیان ئافرەتێکی زۆر بە حەیاو شەرم، زۆر ڕێکوپێك و بـە ئەدەب چوو بۆ ماڵی پێغەمبەری خواو دەسـتی منداڵێکی (١٠) ساڵانی خۆی گرتبوو، دانیشت و عەرزی پێغەمبەری خوای کرد: من ئەم منداڵەم هێناوە بۆ خزمەتت، کە جەرگمەو خۆشەویستمە، بەڵام بە خوا دڵنیام لە لای تۆ بێ بۆی باشترە لەوەی کە لە لای من بێ، بۆیە وا بەخشـیم بە جەنابت و با شـەوو ڕۆژ لە ماڵتاندا بێ و من هیچـم لێی ناوێ. (الله لە ژیری و دڵسـۆزی ئـەم دایکە!). ئەم منداڵە ناوی ئەنەسی کوڕی مالیك بوو، کە بۆ هەمیشە لە ماڵی پێغەمبەردا (ﷺ) مایەوە هەتا پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد.

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە هاتە ماڵەوە، ئەنەسی منداڵی بینی کە زۆر مەحزوون و غەمبارە، (فَداعَبَهُ قائِلاً لَهُ: يا ذَا الأُذنينِ) بۆ لابردنی غەمەکەی دەسـتی کرد بە سـوعبەت و گاڵتەکردن لەگەڵی و پێـی وت: هـەی دوو گوێ!! ئەم منداڵە دەسـتی بۆ هەردوو گوێی بردو دەسـتی کرد بە پێکەنین و خەمی نەما، زانایان دەفەرموون: مەبەسـتی پێغەمبەر (ﷺ) لە (ياذَالأُذُنَينِ) فيهِ مَدْحٌ لِذَكائِهِ وفِطْنَتِهِ

واتە: مەدح و ستایشــی ئەو منداڵەی تێدایە، بە مانای ئەی گوێگرو گوێڕایەڵ بەڵێ هەر ئەم ئەنەســی کوڕی مالیکە برایەکی بچکۆلەی هەبوو نــاوی (عومەیر) بوو، چۆلەکەیەکی هەبــوو، پەتی کردبووە قاچی بۆ خۆی یاری پێ دەکرد، ڕۆژێکیان ئەم چۆلکەیە مردار بۆوەو مرد، ئەم منداڵە کە زۆر هۆگری ئەم چۆلەکەیە ببوو، زۆری پەرۆش بوو، بۆی پەشــێوحاڵ بوو، مات و مەلوول دانیشتبوو، ڕۆژێکیان کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی ئەم ماڵەی کرد، بینی کە ئەم منداڵە (عومەیــر) زۆر غەمبارەو هیچ کەیفی نییەو بە کزۆڵی بۆ خۆی لە شــوێنێکەوە لێی دانیشــتووە، پێغەمبەری غەمخــۆری هەموو کەس پرســی: ئەرێ ئەم منداڵــە جوانە بۆ وا خەمبارە؟! چی لێ بەســەر هاتووە، کێ دڵی ئازار داوە؟ وتیان: قوربان، ئەوە چۆلەکەکەی مردار بۆتەوە، لە پەرۆشی ئەو وا خەمبارە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی کە یاری و گاڵتەیەکی دڵخۆشکەری لەگــەڵ بــکات و ماتــی و مەلوولی ئــەم منداڵە غەمبارە بشــکێنێ، بۆیــە پێی وت: (يا أَبــا عُمَير، ما فَعَــلَ النُّغير؟!). ئــەی ئەبو عومەیر، ئــەوە چۆلەکەکەت چــی کرد؟! بۆ ئەوەی منداڵەکەش دەســت بکات بە قســەکردن و باســی مردنی چۆلەکەکەی بۆ بگێڕێتەوەو دەرگای گفتوگــۆی لەگەڵ بکاتــەوەو مردنی چۆلەکەکەی -کــە لە دڵی ئەو منداڵەدا زۆر گەورەیە- بە لاوە بکات بە شتێکی ئاسایی.

جــا ئیماندارانی بەڕێز: ئەگــەر دڵنەوایی بۆ بولبولێکی مردووی

منالێـــك بكرێ، ئەی دەبێ چەنـــد گەورە بێ، چەند كارێكی پیرۆزو بە بەهاو نرخ بێ، كە دڵنەوایی كەســێك بكرێ كە خۆشەویســتێكی لەدەســت دابــێ، كە مرۆڤە، كــە پارچەیەكە لە ژیان، لــە ماڵی، لە جەرگی، ئەی ئەگەر ئەو كەســە خەمبارە، چاو بە فرمێسكە، بە تۆ سێبوری بۆ بێ و دڵی ئارام ببێتەوە، دەبێ پاداشتی لای خوای گەورە چەندە زۆر بێ؟

بەڵام بەڕێــزان: ئایا ئەم تەعزیەو پرســانەی ئەمڕۆی ناو ئێمە ئەو جۆرەیە كە شــەرع باســی دەكات؟! ئایا بەر ئەو هەموو ئەجرو پاداشــتە دەكەوین؟! لە وەڵامدا دەڵێین: پاداشــتی خوایی و ئەجری قیامەت، كاتێ دەســت مرۆڤ دەكەوێ كە بە پێی شــەرع ئەنجامی بــدات، ڕەحمەتی خوا لە (فوزەیلی كــوڕی عیاض) كە فەرموویەتی: (العَمَل الصّالِح لايُقبَلُ حَتّى يَكُونَ أَخْلَصَ العَمَلِ وأَصْوَبَهُ، قيلَ لَهُ فَما أَخْلَصُ العَمَــلِ؟! قال: أَنْ يَكُونَ لِلهِ، قيلَ فَما أَصْوَبَهُ؟! أَنْ يَكُونَ عَلى السُّــنَةِ، أَي عَلى وُفْقِ ماشَرَعَهُ اللهُ تَعالى).

واتــە: كردەوەی جوان و باش وەرناگیرێ و قبوڵ نابێ لای خوای گەورە، هەتاوەكــو پاكترین و پووختترین كردەوە نەبێ، پێی وترا: مەبەســت لە خالیص ترین و پاكترین كــردەوە چییە؟! فەرمووی: ئــەو كردەوەیە كە تەنهاو تەنها لەبەر خوا ئەنجام درابێ، دوور بێ لە هەموو ڕیاو حەز بە خۆدەرخستن و ناوو ناوبانگێك.. وترا: ئەی مەبەستت لە پوختترین كردەوە چییە؟ فەرمووی: ئەو كردەوەیە كە

لەســەر سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەنجام درابێ، واتە: کردەوەیەکی شەرعی بێ، کە شەرع پەسەندی کردبێ.

حەزرەتــی عومــەری کوڕی خەطــاب، هەموو جارێ لــە دوعاو پاڕانەوەکانیــدا دەیفەرموو: (اللهُـمَّ اجْعَلْ عَمَلـي كُلَّهُ صالِحـاً، وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِكَ خالِصاً).

بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین، کە پاکی نیەت و ئیخلاص و دڵسۆزی لە مەبەستدا، ئەگەر بە گوێرەی شەرع نەکرێ، سود بە خاوەنەکەی ناگەیەنــێ، خــۆ موشــریکەکان وایان گومان دەبرد کــە عیبادەت و بەندایەتیان بۆ خوای گەورە پاك و پڕ لە ئیخلاصە، وە ئەوان کاتێ کە ئەو بتانە دەپەرستن، هەر لەبەر ئەوە دەیانپەرستن کە لە خوای گەورەیان نزیك بکەنەوە!!

بەڵێ، هەر سەرکردەیەك کە شەرع پەسەندی نەکردبێ، بەوەی کە ئەنجامدەری ئەو کارە بڵێ من نیەتی خێرم هەبووەو مەبەستم چاکە بووە، بەو نیەتە خێرە ئەو کارە نابێ بە خێر، هەروەکو (عەبدوڵلای کوڕی مەسعود) کاتێ بینی کەسێك کارێك دەکات کە شەرع نەهی لێ کردووە، فەرمووی: ئەو کارە مەکە، کابرا وتی: (ماأَرَدْنا إِلاَّ الخَير) ئێمە لە خێر زیاتر مەبەستێکمان لە دڵدا نییە، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود فەرمووی: (وَكَمْ مِنْ مُريدٍ لِلخَيرِ لَنْ يُصيبَهُ، إِنَّ رَسُـولَ اللهِ (ﷺ) حَدَّثَنا أَنَّ قَوماً يَقْرَأُونَ القُرآنَ لايُجاوِزُ تَراقِيَهُمْ) صَحيح مُسْلِم، حَديث رَقَم: ١٠٦٦.

واتــە: ئای چەند کــەس هەیە عەوداڵی خێرەو بــەڵام نایپێکێ،

پێغەمبــەری خوا (ﷺ) بــۆی باس کردووین کە کەســانێك قورئان دەخوێنــن، بەڵام لــە قورگیان ناچێتە خوارەوەو هیچ ســودیان پێ ناگەیەنێ!..

صەحابــی پایەبەرز، هەڵگــری نهێنییەکانی پێغەمبــەری خوا (ﷺ) (صاحِبُ سِرُّ الرَّسول) حوزەیفەی یەمانی فەرموویەتی: (كُلُّ عِبادَةٍ لَمْ يَتَعَبَّدْها أَصْحاب رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَلا تَعَبَّدُوها، فَإِنَّ الأَوَّلَ لَمْ يَدَعْ لِلآخِرِ مَقالاً).

واتە: عەر عیبادەت و خواپەرســتییەك کــە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) پێــی هەڵ نەســتابن ئێوەش مەیکەن، چونکــە چینی یەکەم کــە هاوەڵانــی پیغەمبــەرن (ﷺ) هیچیان بۆ چینــی دوای خۆیان نەهێشتۆتەوە لە خێرو چاکە کە قسەی تێدا بکەن..

پێغەمبــەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مَــنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْــسَ عَلَيْهِ أَمْرُنا فَهُوَ رَدٌّ) رواهُ مُسْلِمٌ، حديث رقم: ١٧١٨.

واتە: هەرکەسێك هەر کارو کردەوەیەك ئەنجام بدات کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبووبێت، ئەوە بە سەریدا دەدرێتەوەو خوای گەورە لێی قبوڵ ناکات..

خــۆ ڕەنگە یەکێ بڵێ: ئــەی ئەوە نییە پێغەمبــەری خوا (ﷺ) فەرموویەتــی: (إِنَّمــا الأَعْمــالُ بالنِّيــاتِ، وإِنَّما لِــكُلِّ امْرِيءٍ مانَــوى). رَواهُ البُخاريّ، حديث رَقم: ١.

لــە وەڵامدا دەڵێین: ئەمە بۆ کەســێکە کــە کارەکەی بە گوێرەی شەرع کردووە، بەڵام لە دڵەوە بۆ ڕیاو خۆدەرخستن کردووە، دیسانەوە

ئەوەش لای خەڵك بە زاهیر شەرعییە، بەڵام خوا بە نیەتی ناو دڵی لەگەڵ دەكات و ڕەتی دەكاتەوە بە سەریدا..

لەبــەر ئــەوە موســڵمانانی بەڕێز، بــا لەم مەســەلەی تەعزیەو پرسەشــدا، بگەڕێینەوە بۆ خزمەت شەرع و لە خۆمانەوە لێی زیاد نەكەین و پرسەكانمان با دوور بن لە ناشەرعی، بە ئومێدی ئەوەی خــوای گەورە ڕەحم بە زیندوو و بە مردووانمان بكات و لە هەموو لایەكمان خۆش بێت..

## سەرچاوەكان:

١-رياض الصالحين، الإمام النووي، باب الصبر.
٢-لاتحزن، محمد متولي الشعراوي، ص ٢٣٧.
٣-المائة الثانية من صحيح وصايا الرسول (ﷺ) سعد يوسف أبو عزيز ج١ ص ٦٣.
٤-گۆڤاری هۆنیا، ژمارە ٢١ ل ١٣.
٥-أساسيات الثقافة الإسلامية، الصادق بن عبدالرحمن الغرياني، ص ٤٦٥ و ١٠٦.
٦-لاتحزن، محمد عبدالغاطي بحيري، ص ٣٣.

# بەشی سێیەم

الحَمـدُ لِلهِ رَبِّ العالَـين والصَّلاة والسَّـلام عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّـد وَعَلى آلِهِ وصَحْبِهِ أَجْمَعين

بەڕێزان: لە بارەی تەعزیەوە لە ڕووی شـەرعیەوە شـێوازەکەی ئەوەیە کە دڵنەوایی ئەو کەسـە بکەی کە خۆشەویست و ئازیزێکی لەدەسـت داوە، وە دوعای خێر بۆ مردووەکـەی بکەی کە خوا لێی خـۆش بێـت. بە مانایەکی تـر: تەعزیە بریتییە لـە بوونی تۆ لە لای ئەو کەسـەی کە کەسـێکی مردووەو بە بوونـی تۆ لە لای دڵی بکرێتەوەو غەم و پەژارەی کەم ببێتەوە، بەڵام پێویسـتە لە پرسەو تەعزیەدا ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێ:

١-لەبەر خاتری خوای گەورە بچی و بزانی مافێکی برای موسڵمانتە لە سەرت.

٢-نان نە خۆی لە ماڵی خاوەن پرسەو ئەگەر لێت نزیك بوو تۆ نانی بۆ حازر بکەی.

٣-دانیشتنی تەعزیەت بەو شێوەیە بێ کە باسی دەکەین:

دانیشـتن بۆ تەعزیە لە ڕووی شـەرعەوە: ئەگەر سەیری ژیانی

پێغەمبــەری خوا (ﷺ) بکەین دەبینین لە ژیانی خۆیدا ئەو هەموو خۆشەویستەی وەفاتیان کرد.

لە سەردەمی مەدینەدا، سێ کچی وەفاتیان کرد، ئیبراهیمی تاقانەی وەفاتی کرد، حەمزەی مامی شەهید کرا، جەعفەری ئامۆزای شەهید کرا، ئــەو هەموو صەحابە ئازیزەی کە هەموویانی بە خزمی خۆی دەزانی و پەیوەندی نێوانیان لە پەیوەندی خزمایەتی و کەســایەتی زۆر بەهێزتر بوو، بۆ هەریەکەیان مەحزون و خەمباری زۆر بەسەردا هات، بۆی دانیشــت لە ماڵــەوە، بەڵام خۆ کــەس نەچوو تەعزیەو پرســەی لێ بــکات، هەر لە ڕێگاو بــان و کاتی نوێــژی مزگەوتدا، دڵدانەوەیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەردەبڕی.

لــە صەحیحی بوخاریدا، بە ژمارە فەرمــوودەی (١٢٩٩) لە خاتوو عائیشەوە، دەفەرموێ: (لَمّا جاءَ النَبيَّ (ﷺ) قَتْلُ ابْنِ حارِثَة وجَعْفَرٍ وإِبْنِ رَواحَــةَ جَلَـسَ يُعْـرَفُ فِيهِ الحُزْنُ). واتە: کاتێ هەواڵی شــەهیدبوونی زەیدی کوڕی حاریسەو جەعفەرو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە گەیشتە پێغەمبــەر (ﷺ)، مەحزونــی و خەمبــاری بە پێغەمبــەری خواوە دەبینراو بە ئاشــکرا پێوەی دیاربوو.. بەڵام ئەوەتا خاتوو عائیشــە نافەرمــوێ خەڵکــی دەهاتن بــۆ لای و کۆڕو مەجلیســی تەعزیەی گرتبوو، وە لە سیرەی موبارەکیدا نەهاتووە کە دوای وەفاتی پرسەو تەعزیــەی بــۆ دانرابێ وە هیچ کام لە خولەفای ڕاشــدین تەعزیەو پرسەی بەم شێوەی ئەمڕۆیان بۆ دانەنراوە.

ئەمجــا با بچینــە لای زانایانی گــەورەی ئیســلام بزانین چیان فەرمووە: ئیمامی (نــەوەوی) لە کتێبە بەنرخەکەی خۆیدا (الأذكار) دەفەرموێ: (قال الشـافِعِيُّ وأَصْحابُنا -رَحِمَهُمُ الله- يكره الجُلُوسُ لِلتَعْزِيَةِ، قالُـوا: يَعْـني بالجُلُـوسِ أَنْ يَجْتَمِعَ أَهْـل المَيِّتِ في بَيْـتِ ليقصَدهُمْ مَـنْ أَرادَ التَعزِيَةَ، بَلْ يَنْبَغي أَنْ يَنْصَرِفُوا في حَوائِجِهِمْ، وَلا فَرْقَ بَيْنَ الرِّجالِ والنِّساءِ في كراهَـةِ الجُلُوسِ لَهـا... وَهذِهِ كَراهَةُ تَنْزِيْهِ إذا لَمْ يَكُـنْ مَعَها مُحْدَثٌ آخَرُ، فـإنْ ضَمَّ إِلَيها أَمْرٌ آخَر مِنَ البِدَعِ المُحَرَّمَةِ كَما هُوَ الغالِبُ مِنْها في العادَةِ كانَ ذلِـكَ حَراماً مِنْ قَبائِحِ المُحَرَّمـاتِ، فَإِنَّهُ محدث. وثَبَـتَ في الصَّحيحِ: إِنَّ كُلَّ مُحْدثَةٍ بِدْعَة، وَكُلّ بِدْعَةٍ ضَلالَة. والله أَعْلَمُ).

واتە: شــافیعی و زانایانی پەیڕەوی شافیعی -ڕەحمەتیان لێ بێ- وتوویانە: دانیشتن بۆ سەرەخۆشی ناپەسەندو مەکروهە. وتوویانە: مەبەســت لە دانیشــتن ئەوەیە کەســوکاری مردووەکە لــە ماڵێکدا کۆببنەوە بۆ ئەوەی هەرکەس ویستی سەرەخۆشیان لێ بکات بچێت بۆ لایان، بەڵکو پێویستە بچن بە لای کارو پێویستی خۆیانەوە، لەو کەراهەتی دانیشتنەشدا جیاوازی نییە لە نێوان پیاوو ئافرەتدا، ئەم کەراهەتــە تەنزیهیە ئەگەر هیــچ داهێنراوێکی تری لەگەڵدا نەبێ، ئەگەر شتێکی تری لە بیدعە حەرامەکان چووە پاڵ -وەك بە زۆری باوە- ئەوە حەرامەو لە حەرامە ناشــیرینەکانە، چونکە داهێنراوەو لە فەرموودەشدا چەسپاوە کە هەموو داهێنراوێك بیدعەیەو هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە..

بەلاَم لە زانایانی سەردەم، زانای گەورەو نازدار: (صالح آل الشَّيْخ) دەفەرموێ: (إنَّ الشَيْخ عبد العَزيز بن باز، وَبَقيَةِ المَشايخ يَقولُونَ: لا بَأسَ بالإجْتِماعِ).

واتە: شێخ بن بازو باقی زانایان فەرموویانە: دانیشتن لە شوێنێکدا بۆ پرسەو تەعزیە بە خراپ نازانین، چونکە لە ئەمڕۆدا وەکو زەمانی زوو ناتوانرێ کە لە ڕێگاو بان و سەر دوکان و ناو کشتوکاڵ تەعزیە لە خاوەن مردوو بکرێ، بۆیە ئەگەر کەسوکارو خۆشەویستانی مردووەکە، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە شوێنێکدا دانیشتن، بەبێ ئەوەی نان حازر بکرێ و چا بگێڕدرێ و قورئان بە پارە بخوێندرێ و خاوەن تەعزیە تووشی بێــزاری و ناڕەحەتی بکرێ، وە خاوەن مردوو بــە چاوپێکەوتنی ئەو کەسانەی دەچنە لای و پرسەی لێ دەکەن، صەبوری و ئارامی بۆ بێ و لە خەمی کەم ببێتەوە، ئەوە درووستە.. زانایان دەفەرموون: (وَمَنْ أفْتى بِمَشروعِيَةِ الإجتِماعِ قال: إنَهُ يَدخُلُ تَحتَ قاعِدَة: الوَسيلَةَ لِلمَشروعِ مَشروُعٌ، وأَنَّ الوَسائِلَ لَها أَحكامُ المَقاصِدِ، فَلَمّا كانَ المَقصَدُ وَهُوَ السَّعي مَشروعاً، فَوَسيلَتُهُ الآن وَهِيَ الإجتِماعُ مَشروُعَةٌ).. (يَسألُونَكَ.. د. حسام الدّين ج ٥ ص ٣٣).

بــەلاَم ئەمڕۆ لەم ســەردەمەدا بە تایبەتی زیــادەڕەوی کردن لە پرسەو تەعزیەدا گەیشتۆتە ڕادەی بێ شەرعی وەکو:

١-دروســتکردنیی هۆڵی تایبەت بە نــاوی تەعزیەخانەوە، کە بە لای هەندێ لە زانایانەوە، فەرمانڕەوای وڵات پێویســتە هەڵســێ بە ڕوخاندنی پرســەخانەکان، خۆ ئەگــەر بارودۆخێکی ناچارکەر وای کرد کە هۆڵی پرسە ببێ ئەوا:

١-نابێ لە سنوری پێویستی دەربچێ، شارۆچکەیەك تەعزیەخانەیەك یان دوانی بەسە، نەك هەموو گەڕەكێك تەعزیەخانەی خۆی هەبێ!

٢-نابێ تەعزیەخانە لە زەوی وەقف کراو بۆ مزگەوتدا، دروست بکرێ. بە دڵنیاییەوە ئەگەر تەعزیەخانە خێری تێدا بوایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی خۆی لەگەڵ مزگەوتەکەیدا ئەویشی دروست دەکرد، بەڵێ نابێ تەعزیەخانە لە زەوی وەقفی مزگەوتدا دروست بکرێ، بەڵکو پێویستە تەعزیەخانە لە شوێنێکدا بێ کە وەکو هۆڵی بۆنەکان وابێ، هەم بۆ شین بێ هەم بۆ شایی و کۆڕو کۆبوونەوەی جەماوەری بەکاربهێنرێ.

٣-نابێ کەس زەوی خۆی ببەخشێ بۆ ئەوەی تەعزیەخانەی لەسەر دروست بکرێ و وابزانێ خێرێکی باشی کردووەو صەدەقەی جاریە وەکو مزگەوت!

٤-نابێ پارەی مزگەوت بۆ تەعزیەخانە خەرج بکرێ، بەڵکو دەبێ کەسێك خۆی پارەی بۆ تەرخان بکات، کەواتە دروست نییە بە ناوی مزگەوتەوە پارە کۆبکرێتەوەو پاشان لە تەعزیەخانەدا صەرف بکرێ، بەڵام بە داخەوە چونکە خەڵکی پرس بە شەرع ناکەن، هەی وا هەیە وەصیەتی کردووە کە ئەگەر مرد، ئەوەندە پارەی بۆ بخەنە مزگەوتەوە، بەڵام کەسوکارەکەی دەیدەنە دەست دوو سێ نەزان کە دەگەڕێن بۆ پارەکۆکردنەوە بە ناوی مزگەوتەوە، پاشان لە دروستکردنی تەعزیەدا بەکاری دێنن!! ئای چ بێ شەرعیەکی گەورەیە لە هەندێ شوێن، لە شارەوە تا لادێ، دەبینی کە تەعزیەخانەکەیان

لە ڕووی بیناسازی و پاکوخاوێنییەوە زۆر لە مزگەوتەکە خۆشترەو پاکوخاوێن ترە!! بینیومانە تەعزیەخانە هەمووی کاشی کراوە، کەچی مزگەوتەکە چیمەنتۆکەی هەمووی هەڵیداوەو هەڵکەناوەتەوە.

لـــەم وڵاتەی ئێمە نەبێ کە چەند ســـاڵێکە ئەمـــە پەیدا بووە، لە هەموو دنیادا تەعزیەخانە لەناو مزگەوتدا دروست نەکراوە.. ئای بە داخەوە ئێمە مردووپەروەری زیندووکوژین. باشە ژێر مزگەوت بازاڕو دوکان بێ و دەیان کەس تێیدا خەریکی کارو کەســـابەتی حەڵاڵ بن و وەختی نوێژ بێنە مزگەوت، باشـــتر نییە لەم هەموو تەعزیەخانە گەورەیەو خەرجکردنی ئـــەو هەموو پارەی کە بە ناوی مزگەوتەوە لەو خەڵکە کۆکراوەتەوەو لەو بێ شەرعیەدا خەرج بکرێ؟!

بەڕێزان: ئەمەی کە وتمان دەربارەی دانیشتن بۆ تەعزیە، کە لانی کەمی مەکروهـ و ناپەســـەندە، دانیشـــتنە بۆ تەعزیە لە ڕۆژدا، لە کاتی پرسەدا، ئەی ئەو کەســـانەی کە دوای هەڵسانی تەعزیەخانەکەش واز لە کەسوکارو بنەماڵەی مردوو ناهێنن، هەیانە شـــەوانەش هەر دەچنەوە بۆ دانیشتن بۆ تەعزیە، کە دەست دەکەن بە باسی سیاسی و نێودەوڵەتی و چای بە دەمەوە دەخۆنەوە، بێ ڕەچاوکردنی حاڵی خاوەن پرســـەو هیلاکی و ماندووبوونی، کە بە ڕاستی ئەم دانیشتنە بەم شێوەیە زوڵم و بێویژدانییە.

ئیماندارانی بەڕێز: بە ڕاســـتی ئەم تەعزیەی کە ئەمڕۆ دەکرێ، بەم شێوازەی ئێستای، زۆربەی هەرە زۆری لە شەرعدا جێی نابێتەوە، بەم بەڵگانە:

١-هەموویان گیرمان خواردووە بە دەست تەعزیەوە، هەموومان لە دانیشتن و وەستانی تەعزیەی خزم و کەس و دۆستانمان ئەترسین، دەی ئەگـــەر تەعزیـــە بەم شـــێوەیە شـــەرعی بوایـــە، نەدەبوو ئەم ناڕەحەتی و ئازارو ماندووبوونەی تێدا بوایە، چونکە ئەوەی ئیسلام فەرمانـــی پێکردووە ناڕەحەتی و ئازاری تێدا نییە. (وَماجَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ). تۆی موسڵمان وەرە بە پێی شەرع تەعزیە دابنێ، هەر لەسەر قەبرانەوە بڵاوەی لێ بکەو با دراوسێ و خزم و دۆستان نان بۆ کەسوکاری خاوەن پرسە بە تایبەت ماڵ و منالی ئامادە بکەن -نەك نانیان پێ ئامادە بکەن- ئایا ئەو کاتە تەعزیە کوێی گرانە؟! هـــەر ئەوەی کە ئەمڕۆ تەعزیە ئەو هەموو ناڕەحەتیەی تێدایە بۆ خۆی بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ئەوەی کە شەرعی نییە.

زانایەك قســـەیەکی بەجێ و جوانی هەیە کە دەفەرموێ: (النَّاسُ إِذا صـــارَتْ أَعمالهم لِغَـــيْرِ اللهِ، أَصابَهُمْ العَنَتُ والشَّـــقاءُ). (أَساســـيات الثَّقافَة الإِسلامِيَّة، ص ٤٧٧).

واتـــە: هەرکاتێ خەڵکی کردەوەکانیان بۆ غەیری ڕەزامەندی خوا بوو -وە بە گوێرەی شەرع ئەنجامی نەدا- ئەوە تووشی ماندووبوون و چەرمەسەری و بەدبەختی دەبن..

٢-تەعزیە بۆ دڵدانەوەیە، بە مەبەستی:

أ-ئەجرو پاداشـــت دەستکەوتن لای خوای گەورە، کە بەجێهێنانی مافێکی برای موسڵمان لەسەر برای موسڵمانی بەم تەعزیەو دڵدانەوەو

هاوخەمییە جێبەجێ دەبێ و پاداشتی خوای لەسەر وەردەگیرێ، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەی شیرینیدا ئاماژەی پێدا.

ب-بە چەند وشەیەکی شەعی و جوان دڵدانەوەی خاوەن مردوو بکەی.

ج-دوعایەکی خێر بۆ مردووەکە بکەی، بەڵکو ئەو هەموو کەسەی کە پرسە بۆ خاوەن مردو دەردەبڕن و دەڵێن: یا ڕەبی خوا لێی خۆش بێ -ئەگەر لە دەمی پاك و دڵی بەکوڵەوە بێ و بۆ ڕیاو ڕووپامایی نەبێ، ئەوە إِنْ شاءَالله خوا لەو مردووە خۆش دەبێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (أَيُّما مُسلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيرٍ، أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ) رَواهُ البُخارِيُّ ١٣٦٨.

واتە: هەر موسڵمانێك چوار کەسی ئیماندار شاهیدی چاکەی بۆ بدەن و بڵێن بە ڕاستی کەسێکی چاك و باش بوو، ئەوە خوای گەورە ئەو موسڵمانە دەخاتە بەهەشتەوە.

بەڵام ئیمانداران: بفەرموون با بە وردی سەیر بکەین و سەرنج بدەین، ئایا تەعزیەی ئەمڕۆ ئەو خاڵانەی تێدایە کە باسمان کردن؟ بێگومان لە زۆربەیاندا نەخێر. چونکە:

أ-کەم کەس بۆ پاداشتی خوایی دەچن بۆ تەعزیە، ئەگەر دەڵێی وا نییە پێت دەسەلمێنم: لە شەرعدا دوو خێری زۆر گەورە هەیە، کە هەم بۆ ئەو کەسەی دەیکات هەم بۆ خاوەنی مردووەکە، هەم بۆ مردووەکە قازانج و سودێکی یەکجار زۆری هەیە، ئەویش نوێژی جەنازەو چوونە سەر قەبرانە، چونکە بە ئامادەبوونی خەڵکێکی

زۆر لە کاتی نوێژی جەنازەو کاتی بە خاکسپاردنی مردووەکە، دڵی خاوەن مردوو لە هەموو کاتێ زیاتر ئارام دەگرێ. کە ئەگەر لەم دوو حاڵەتەدا دەوری چۆڵ بوو، بە خوا هیچ کات بە قەرەباڵغی تەعزیە دڵی ناکرێتەوە، ئاها شــەرع چەند جــوان فەرموویەتی، ئاگاتان لەو دوو حاڵەتە بێ و باســی دانیشــتنی تەعزیەی مزگەوت و ماڵەوەی نەکــردووە.. بەڵام بە داخەوە بە چاوی خۆمان دەبینین ئەو هەموو خەڵکە لە حەوشــەی مزگەوتدایە، ئاو هەیە، شــوێن هەیە، نوێژی جەنازە (مردوو) ئەوەندە ئاسانە هەموو کەس دەتوانێ فێری ببێ و ئەنجامی بدات، تەنانەت هەر هیچ نەڵێی وەکو ئەو هەموو موسڵمانە لە ڕیزی نوێژی مردوودا بوەســتی و هەر (الله أكبر) بکەی نوێژەکەت دروستەو ئەجرو پاداشتەکەت دەستگیر دەبێ، کەچی کاتێ مامۆستای مزگەوت بانگ دەکاو دەفەرموێ: ڕحمەتی خواتان لێ بێ، کێ نوێژی جەنازە دەکات با ئامادە بێ، کەچی جێگای داخە زۆرێك لەو خەڵکە بەملاولادا خۆی لادەدات و ئامادە نییە ئەم نوێژی جەنازە بکات، کە دیارە ئەم کەسە: خێری ناوێ بۆ خۆی، وە دەیسەلمێنێ مردووەکەشی خۆش ناوێ -خۆشەویســتی ڕاســتەقینە بناغەکەی لەسەر دینداری و خۆشەویســتی لەبەر خوا دامــەزراوە- چونکە ئەگەر مردووەکەی خۆش بویستایە، نوێژی مردووی بە جەماعەت لەسەر دەکرد، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ما مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ عَلى جَنازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً، لايُشْرِكُونَ بِاللهِ شَيْئاً، إلاّ شَفَّعَهُمُ اللهُ فِيهِ).

واتە: هەر موسـلّمانێك بمرێ و چل پیاو لەو كەسـانەی كە هیچ جۆرە هاوبەشییەكیان بۆ خوا دانەناوە، لەسەر جەنازەكەی بوەستن و نوێژی مردووی لەسـەر بكـەن، ئەوە ئەو نوێـژی مردووەو ئەو دوعا خێرانەی كە بۆ ئەو مردووەی دەكەن، دەبێتە هۆی شەفاعەت و تـكاكاری لـە لای خوا بۆ ئەو مردووەو خـوا تكاكەیان وەردەگرێ و لـەو مردووە خـۆش دەبێت... هەروەها لـە فەرموودەیەكی تردا، پێغەمبـەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (مامِنْ مُؤْمِنٍ يَمُـوتُ، فَيُصَلِّي عَلَيْهِ ثلاثة صفوف مِنَ الْمُسْلِمينَ إِلاّ أَوْجَبَ).

واتە: هەر ئیمانداێك بمرێ و سێ ڕیز لە موسلّمانان نوێژی مردووی لەسـەر بكەن، ئەوا بۆی واجب دەبێت. واتە: لێخۆشـبوونی خوای بۆ واجب دەبێت، چونكە نوێژی مردوو، داوای لێخۆشـبوونی خوایە بۆ مردووەكە، وە هەروەها چوونە سـەر قەبران، كە خێرو پاداشتەكەی ئەوەندە گەورەیە، لە فەرموودەدا هاتووە كە: (مَنْ صَلّى عَلى جَنازَةٍ فَلَهُ قيراطٌ، وَمَـنْ إِنْتَظَرَها حَتَّى توضَع فِي اللَّحدِ، فَلَهُ قيراطان، والقيراطانِ مِثْلُ الجَبَلَيْنِ العَظيمَيْنِ) رَواهُ أحمد في مُسْنَدِهِ: ٤٨٦٧، الصَّحيحَة: ٢٣٥١.

واتە: هەركەسـێ نوێژی مردوو لەسـەر جەنازەیـەك بكات، ئەوە قیراتێك پاداشتی دەست دەكەوێ، وە هەركەسیش دوای ئەوەی نوێژی مردووەكەی كرد، چاوەڕێی كرد هەتا مردووەكەش دەخرێتە گۆڕەوە، ئەوە بە ئەندازەی دوو قیرات پاداشتی بۆ دەنوسرێ، ئەمجا پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی: مەبەست لە دوو قیرات، وێنەی دوو شاخ و چیای

زۆر گەورەن، واتە بە قورسایی دوو شاخی گەورە چاکە بۆ ئەو کەسە دەنوسـرێ!.. کەچی بە داخەوە کەس خۆی ناگەیەنێتە سـەر قەبران و پەلەی بۆ ناکات بۆ ئەوەی ئەو پاداشـتە گەورەی بە نسـیب ببێ، بەڵام خەریکە ئوتومبێلەکەی وەردەگێڕێ بۆ ئەوەی فریای تەعزیەکە بکەوێ، کە بە ڕاستی زۆربەی بۆ ڕیایە، چەند جار ئێمەی مامۆستایانی ئاینی و ئێوەی بەڕێزیش سـەرنجمان داوە، کاتێك کەسـێك مردووە، کوڕەکانی و براکانی و مام و خاڵ و خزمە نزیکەکان، فەقیرو هەژارو نەناسـراون، لە مزگەوت و لەسەر قەبران بە هەمووی (٢٠) کەسی لێ نەبووە، کەچی لە کاتی تەعزیەکەیدا کە خزمێکی دووری مەسئول و دەوڵەمەندو ناودار بووەو هاتووە بەشداری پرسەکەی کردووە، خەڵکی لەبەر خاتری ئەو ئەوەندە هاتووە بۆ تەعزیەکەی شوێن نەبووە لێی دانیشـی!! کەواتە: مەبەسـت و ئامانج لە تەعزیەی ئەم ڕۆژگارە بە زۆری بۆ پاداشتی خوایی نییە، هێندەی بۆ دونیاو خاتری خەڵکە.

خاڵی دووەم: وتمان پێویستە بە چەند وشەیەکی شەرعی و جوان دڵدانـەوەی خاوەن مردووەکە بکـەی، کەچی هی وا هەیە دەڵێ: بۆ خۆتان سـەلا مەت بن، عومری درێژی بۆ خۆتان بەجێ هێشـتبێ. بـڕوا بکـەن لە تەعزیەدا گوێـم لێ بووە، ئەو کەسـەی هاتووە بۆ تەعزیـە بە خاوەن مردووی وتووە: عەفوی کا!! باشـە کێ عەفوی کا؟! ئەی بۆ ناڵێی خوا عەفوی کا، بۆ ناوی خوا -سُبحانَهُ وتَعالی- کە هەر ئەو -العَفُوَ- ناهێنی؟

خاڵی سـێیەم: دوعا بە کوڵ و بە دڵ بۆ مردووەکە بکرێ، بەڵام زۆربەی ئەوانەی بەشداری پرسە دەکەن، هەر وەکو عادەت دەڵێن خوا لێی خۆش بێ، ئەینا دڵی ئاگای لە دوعاکە نییە، ئەمەی باسی دەکەم لە بواری نوکتەو قسەی خۆش نییە، حەقیقەتەو ڕووی داوە.

لـە شـاری (ك) لە کوردسـتانی خۆمان، کابرایەکـی نۆکاوفرۆش چوبـووە تەعزیەیەکەوە لەنـاو تەعزیەکەدا کە هـەر خەیاڵی لای نۆکاوەکەی ببوو، هاواری کردبوو: نۆکاو نۆکاو!!

لە شاری (س)یش هەر لە کوردستانی خۆمان، ساڵی پار کابرایەك لە پرسـەیەکدا، لە کاتی هەڵسـانی دوای فاتیحە خوێندنەکەیدا، لە جیاتی ڕووبەڕووی خاوەن پرسـە بڵێ: خوا لێی خۆش بێ، وتبووی: خوا بازاڕتان با!! وای زانیوە هەر لە بازاڕە!

بەڵام زانایان فەرموویانە: (التَعزِيَةُ فِي الحَقيقَةِ لَيسَتْ تَهْنِئَة كَما ظَنَّها بَعْضَ العَوام) شرح رياض الصّالِحين - إبنُ عُثَيمين - ج١ ص٩٢.

بەڵێ موسڵمانانی بەڕێز: لەمڕۆدا تەعزیە چەندان جۆرە ڕەفتاری ناشەرعی و سەرەنجامی خراپی لێ کەوتۆتەوەو دنیایەك لە بیدعەو داهێنراوی ناپەسەندو خراپ و حەرامی هاتۆتە پاڵ، لەوانە:

١-کردنـی کۆڕو فەرەباڵغی ئەو سەرەخۆشـییە بـە هۆکارێك بۆ بەخۆنازین و فیزلێدان و خۆڕانواندن بەسـەر خەڵکی موسـڵماندا، بێگومان ئەمـەش پێچەوانەی ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلا تَكونوا كالَّذين خَرَجُوا مِنْ دِيارِهِمْ بَطَراً وَرِئاءَ النَّاسِ) الانفال: ٤٧.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إنَّ اللهَ أَوْحَى إِلَـيَّ أَنْ تَواضَعُوا، حَتَّى لايَبْغي أَحَدٌ عَلى أَحَد، ولا يَفخر أَحَدٌ عَلى أَحَد) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: بێگومان خوا وەحی بۆ کردووم کە ئێوە خۆ بەکەم زان بن، بۆ ئەوەی هیچ کامتان ستەم لە کەسی تر نەکات و هیچ کامتان شانازی بەسەر کەسی تردا نەکات.

بە داخەوە دەبینین لە کاتی پرسەو تەعزیەدا هێزی عەشیرەت و بنەماڵە دەنوێندرێ و زۆرترین خەڵك کۆدەکرێتەوەو خۆی پێوە هەڵدەکێشرێ کە تەعزیەی فلان بنەماڵە زۆر قەرەباڵغە!! هەروەها ئەمڕۆ تەعزیە بۆتە مەیدانی حیزبایەتی کردن و لافیتە هەڵواسینی حیزبەکان.

مردوو شەیتان وازی لێ هێناوە، حیزب هێشتا وازی لێ ناهێنێ، پرسەی وا هەیە چەندین لافیتەی پێوەیە، هەریەکەی هی حیزب و لایەنێکی سیاسی و فەرمانگەیەك و ڕێکخراوێك، ئەمە خزمی فلانەو ئەوە هاوڕێی فلانە، خەریکە وای لێ بێ خەڵکی شانازی بە زۆری لافیتەی تەعزیەی مردووەکانیشیانەوە بکەن!! خۆزگە حیزبەکان وەکو دەستیان خستۆتە ناو هەموو شتێکەوە، وازیان لە مردووەکان و تەعزیەکان بهێنایە.

٢-زۆرێك لەو کەسانەی کە دەچن بۆ تەعزیە، تووشی ڕیایی و ڕووپامایی دەبن بەرامبەر خاوەن پرسە، ئەویش بەوەی کە زیاد لە پێویست هەست و سۆزو هاوخەمی بە ڕواڵەت و بە قسە بۆ خاوەن مردوو دەردەبڕن، بەڵام لە ناخەوە وا نین و جار هەیە کە

دوورکەوتنەوە بە زمانیش نەفرەتی لێ دەکەن! ئەوەتا کەسی وا هەیە ئەگەر بچێ بۆ تەعزیەیەك و ئەوەی ئەو لەبەر خاتری چووە لەبەر قەرەباڵغی چاوی پێی نەکەوتبێ ئەوا دووبارەو سێ بارە دەچێتەوەو خۆی نیشان دەداتەوە بۆ ئەوەی بۆی حیساب بکەن!! کە ئەمەش بۆ خۆی جۆرێك لە ڕیاو ڕووپامایی و نیفاق دروست دەکات.

٣-کردنی تەعزیە بەرێ و ڕەسمێکی وا گەورەو گرنگ کە لادان لێی تاوانێکی قورس بێت لە دیاردە خراپەکانیشی:

أ-ئامادەبوونی ناچاری، کە زۆربەی ئەوەی کە لە دوورەوە دەچێتە تەعزیە یان ئیشوکاری زەروری بەجێ هێشتوە بە ئاشکرا ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێ و بەڵکو هەرچی دەیبینی هاواریەتی لە دەست تەعزیەو هەمووی بە کارێکی قورسی دەزانێ.

ب-وەستان بە پێوە بە ناچاری، ئەگەر خاوەن مردوو فەقەراتیشی لەگەڵ بێ و لەتاو ئازاری پشت و ئەژنۆی ئارامی لێ بڕابێ، هەر ناچارە لەبەر لۆمەی خەڵکی هەر بە پێوە بوەستێ و چەند کەس هەبووە لە تەعزیەدا هێندە بە پێوە وەستاوە، بە لادا کەوتووەو ئیتر لە ئەنجامی ئەو بێ پشوییەدا تووشی گەلێ نەخۆشی بووە!! کە ڕاست و ڕەوان تەعزیە بۆتە (تەعزیب) و سزاو ئەشکەنجەدان، لە جیاتی دڵدانەوە.

٤-بەفیڕۆدانی کاتێکی زۆری خەڵکی بە تەعزیەوە، کەسانێك هەن تەواوی ژیانیان بۆتە ڕۆیشتن بۆ تەعزیەو لەم تەعزیە ناگەڕێنەوە،

هەواڵی تەعزیەیەکی تریان پێ دەدرێ و بە ناچاری دەبێ بۆی بڕۆن و هەموو ژیانیان بۆتە تەعزیەکردن، کە بە ڕاستی ئەمەش کوشتنی کاتە، گەورەترین سەرمایەی مرۆڤ کاتەکانیەتی کە نابێ هەمووی لە تەعزیەدا خەرج بکرێ.

٥-ناچارکردنی خاوەن مردوو کە بکەوێتە خۆی و مەمنونی ئەم و ئەو بێ و ماڵ و سامانێکی زۆر خەرج بکات، کە جاری وا هەیە قەرزی بۆ دەکات، ئەمە سەرەڕای دڵ بە خەمی و لە دەستچوونی ئازیزو خۆشەویستانی، هەر لەو کاتەوە کە لەسەر قەبرانە دەبێ خەمی دابینکردنی خەرجی و پێویستی دانیشتنی تەعزیەو جێگاو ڕێگادا بێ، لەو ئەرك و زەحمەتانەش ئامادەکردنی خواردن بۆ میوانانی تەعزیە، کرینی ئاو، هەڵدانی چادرو خێمە، گرتنی ڕێگاوبانی کۆڵان و گەڕەك، گرتنی قورئان خوێن، پێویستییەکانی سێ ڕۆژانە، بەجێهێشتنی ماڵ و حاڵ لە لایەن زۆرێك لەوانەی دێنە پرسە، بە تایبەتی ئافرەتان و پشتگوێخستنی ماڵ و مێردو مناڵ، کە زۆر جار دەرەنجامی نەخوازراوی خراپی لێ دەکەوێتەوە.

هەروەها پیسبوونی ماڵ و جێگاو ڕێگای خاوەن پرسەو زۆر خانوو وای لێ دێ بەکەڵك نامێنێ، ڕەحمەتی خوا لە شێخ (سید سابق) کە لە کتێبی (فِقهُ السُنَّة)دا دەفەرموێ: (سوننەت وایە کە پرسەو دڵدانەوە پێشکەش بکرێ بە کەسوکارو خزمی مردوو، پاشان هەریەکە بڕوا بە لای کارو پێویستی خۆیەوە، بەبێ ئەوەی هیچ کەس چ خاوەن پرسەو چ سەرەخۆشیکەر بۆی دانیشێت. ئەمە ڕێڕەوی پێشینە چاکەکان بووە،

وە ئەوەی ئەمڕۆ هەندێ کەس دەیکەن لە دانیشتن بۆ سەرەخۆشی و ڕیزکردنی کورسی و ڕاخستنی فەرش و خەرجکردنی سامانی بێشومار لـــە پێناوی بەخۆنازین و شـــانازیکردن، لـــەو کارە داهێنراوو بیدعە خراپانەیە کە واجبە لەســـەر موسڵمانان لێی دوور بکەونەوەو بۆیان حەرامە بیکەن، بە تایبەتی کە زۆرێکی سەرپێچی ڕێنمایی قورئانەو پێچەوانەی سوننەتە و بە پێی دابونەریتی نەفامی دەڕوات..).

لە کۆتایی ئەم وتارەشدا لەسەر بابەتی پرسەو تەعزیە، بە پێویستی دەزانم کە ڕوو لەو کەســـانە بکـــەم کە مردوویان لێ دەمرێ و -هیچ کەســـیش نییە لە ژیانیدا مردوویەکی ئازیزی لێ نەڕوات- لە جیاتی لە ســـنوور تێپەڕاندنی تەعزیەو تووشبوون بە ناشەرعی، دڵی خۆتان بە پاداشـــتی خوای گـــەورەو میهرەبان خۆش بکەن کە بۆ ئارامگرانی داناوە، کە خۆی فەرموویەتی: (إِنَّما يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسابٍ)، هەروەها بەوە دڵ خۆتان بدەنەوە کە ئەو کەسەی کە مردوو بەجێی هێشتن کاتی خۆی بوو، دەبوایە لەو کاتەداو لەو جێگەداو بەو ڕووداوە بمردایەو هیچ خۆپارێزییەکی لێ نەدەکرا.

ژیان پڕە لە ڕووداوی سەرنجڕاکێش کە هەمووی ئەو ڕاستییەمان بۆ دەسەلمێنێ کە وتمان، بۆ نموونە: کەسێك بە ناوی (هنری زیگلاند) دانیشتووی تەکساســـی ئەمریکا، لە لایەن برای خۆشەویستەکەیەوە تەقەی لێ کرا، بەڵام فیشەکەکە بەری نەکەوت و چووە نێو دارێکەوە، پـــاش (٢٠) ســـاڵ لەو ڕووداوە، هەر ئەو فیشـــەکە (هنری) کوشـــت!!

چۆن؟! کاتێك دوای بیست ساڵ هنری ئەو دارەی ناو ماڵەکەی بڕیەوە، مشارەکە بەر فیشەکەکە کەوت کە لە دارەکەدا مابۆوەو لێی دەرچووو بەر سەری کەوت و دەستبەجێ کوشتی!!.. (کۆمەڵ).

لە کوردستانی خۆشماندا، لە پارێزگای سلێمانی، لە ناوچەی شارباژێڕ ماڵی کوڕێك کە دانیشتووی شاری سلێمانی دەبن، بڕیار دەدەن کە کچی ماڵێکی خزمیان کە لە گوندێکی شارەباژێڕ دادەنیشن بۆ کوڕەکەیان بخوازن، بەڵێ خوازبێنی دەکرێ و کچە پێشکەش بە کوڕە دەکرێ و هەردوولا لەسەر ئەوە ڕێك دەکەون کە لەبەر ئەوەی لە گوندەو هۆڵی شەکراوخواردنەوە نییە وەکو شار، نان و خۆراکێکی زۆر ئامادە بکەن و خزم و دۆستان بانگ بکەن بۆ ڕۆژی مارەکردنەکە، بەڵێ ماڵی زاوا لە شارەوە خەڵکیکی خزم و دراوسێ و ناسیاو لەگەڵ خۆیان دەبەن و دەچنە گوندەکەو نان و خۆراك حازر دەکرێ و بۆ خۆشی و دڵکرانەوە لەناو باخێکدا نان دەخۆن، سُبحانَ الله لە کاتی نانخواردندا کەڵەکە دیوارێکی وشکەکەڵەکی بەرد، کە چەند ساڵە دروست کراوەو وەکو ڕەوەزی ناو ڕەزو باخ خۆڵی لە دواوەکراوەو هیچ کات بەردێکی لێ نەجوڵاوە، لە پڕدا هەرەس دەکاو دەڕوخێ و کوڕێك کە ماوەی چەند مانگێك بووە هاوسەرگیری کردووە لە خزمانی زاوا، لەگەڵ خێزانەکەی بە یەکەوە سینیەك نانیان وەرگرتووەو بە خۆشییەوە لەژێر ئەو دیوارەدا نانیان خواردووە، بەڵام بە هۆی ڕووخانی ئەو هەمو بەردەوە بە سەریاندا دەستبەجێ گیان لەدەست

دەدەن!! ئاخـــر کێ دەیزانـــی ئەو دیوارە مەرگی ئەو دوو هاوســـەرە نوێیەی لەخۆدا حەشـــار داوەو لە کات و ســـاتێکی ئاوا پڕ شـــایی و شـــادیدا، شایی دەکات بە شـــیوەن؟! ئەمە دەستی قەدەرێکە کە هیچ کەس توانای بەسەریدا نییەو پەی پێ نابات.. (بەیان، ژ: ٥).

ڕووداوێکی تر: لە دەزگاکانـــی ڕاگەیاندنەوە بلاوکرایەوەو بەندە خۆم گوێبیســـتی بووم کە لە ڕۆژی (٢٠٠٩/١٢/١٦)دا لە شـــاری موصڵ تەقینەوەیـــەك بوو، یەکێ لە قوربانییەکان منداڵێکی تەمەن (حەوت) ڕۆژ بوو، ئەم منداڵە هی ژن و پیاوێك بوو کە (١٢) ســـاڵ بوو ژیانی هاوســـەریان پێکەوە نابوو، بەلام منداڵیان نەبووبوو، دوای (١٢) ســـاڵ چاوەڕوانی ئەم منداڵەیان بوو، کە حەفتەیەك بوو لەدایك ببوو، دایك و باوکی بردبوویان بۆ کوتان، لە ڕێگەدا بەر ئەو تەقینەوەیە کەوتن و دایك و باوکەکە سەلامەت بوون و منداڵەکە دەستبەجێ مرد!!!...

تا وتاری داهاتوو بەخواتان دەسپێرم

## سەرچاوەکان:


١-أساسِيات الثّقافَة الإسلامِيَة، ص ٤٧٥، تأليف: الصّادق بن عبدالرحمن.

٢-يَسألونَكَ، د. حسام الدّين عَفانَة، ج ٥ ص ٣٣.

٣-منْهاج الصّالحين في الآداب الإسلاميّة، محمد عبدالعاطي بحيري، ص ٥٠٢، ٥٠٠.

٤-شَرح رياض الصّالحين، إبنُ عُثَيمين، ج ١ ص ٩٢.

٥-ڕۆژنامەی کۆمەڵ.

٦-ڕۆژنامەی (بەیان) ژمارە: ٥، ل ١١.

# بەشی چوارەم

الحَمْـدُ لِلهِ رَبِّ العالَمـين والصَّلاة والسَّـلام عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّـد وَعَلى آلِهِ وصَحْبِهِ أَجْمَعين

شاعیر زۆر جوان و ڕاستی فەرمووە:

(لَوْ كانَتِ الدُنيا تَدوُمُ لِواحِدٍ... لكانَ رَسُولُ اللهِ فيها مُخلَّداً).

واتە: ئەگەر دونیا بۆ هیچ کەس تا سەر بوایە، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەبوایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە هەمیشەیی تێیدا بمایەتەوەو هیچ کات ئەو خۆشەویست و نوری چاوە دونیای جێ نەهێشتایە.

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: بێجگە لە دڵدانەوەی خەڵکی بۆ خاوەن مردوو، وا چاکە ئەو کەسـەی مردووی لێ دەمرێ خۆشی دڵی خۆی بداتەوەو دڵنەوایی خۆی بکات بەوەی:

١-ئەمـە ڕێبازی هەموو کەسـێکەو ئەو کەسـەی مـردووە کاتی دیاریکـراوی خۆیەتی و هەردەبوو لەم سـات و کاتـەدا بمرێ و نە پێش دەخرێ، نە دوا دەخرێ.

٢-ئەو کەسـەی خۆشەویسـتێکی دەمرێ، چاك وایە تەنها دوعای ئەوە بۆ مردووەکەی بکات کە بە ئیمانەوە مردبێ، وە خوای گەورە

لــە ڕیزی چاکان و پــاکان وەری بگریّ، چونکە ئەو کاتە پیرۆزبایی دەویّ ﴿فَأَمَّــا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ، فَــرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ، وَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ، فَسَلَامٌ لَكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ﴾ الواقعة ٨٨.

بەڵێ ئەگــەر مردووەکەت ئەهلی ئیمان بێ، ئــەوا لەو کاتەدا کە تــۆ بــۆی دەگری و دەڵێی توخوا بەجێمــان مەهێڵە ئەو لە ناو دارە مەیتەکەیدا دەڵێ: (قَدِّمُونِي، قَدِّمُونِي) پەلە بکەن، پێشــم بخەن، زوو بمگەیەننە گۆڕەکەم کە یەکەم مەنزڵی قیامەتمە، چونکە ئەو قەبرەم باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت و حەز دەکەم زوو پێی بگەم.

بەڵــێ تــۆ وا دەزانی ئەو مــردوومت لەو قەبــرەدا بە تەنها جێ هیشــتووە، بــەڵام ئەگەر ئــەو مــردووە ئەهلی ئیمان بــێ، ئەمجا دەکەوێتــە ناو قەرەباڵغی و ئاوەدانییەوە، قەرەباڵغی و ئاوەدانییەك کە وەکو هی دونیا نییە، تووشــی سەرئێشەو قیل و قال و غەیبەت و موناقەشــەو گفتوگۆی بێســوودی بکات، قەرەباڵغــی دونیا زۆری ڕووکەش و ڕیــاو نیفاقە، بەڵام مردووی ئیماندار بە مردنی دەگات بە جیهانێکی ئاوەدان، جیهانێك، خەڵکانێکی بێشــومار، کە هەرچی ئیمانداره لە زەمانی ئادەمەوە تا قیامەت، هەمووی دەبن بە هاوڕێ و ڕەفیق و کەسوکاری، هەمووی برای ڕاستەقینەنی، درۆو دووڕوویی و فــرت و فێــڵ و حەســوودی و بەخیلــی تێدا نییــە، بۆیە بیلال جوانی فەرمووە کە ئامۆژگاری هاوســەری دڵســۆزی ژیانی کرد، کاتێ کە خێزانەکەی لە تاوی بیلال کە لەســەرەمەرگدا بوو هاواری کرد:

(واكَرْبَتاهُ). بەڵكو بڵێ: (وافَرْحَتاهُ، غَداً أَلْقَى الأَحِبَّة، مُحَمَّداً وَحِزْبَهُ). ئای چەند خۆشە مرۆڤ كاتێ ئەزانێ ئەوە دوا چركەی ژیانیەتی ئاوا بە مردن دڵخۆش بێت، چونكە ئەزانێ قیامەتی ئاوەدانە.

ئەی ئەو كەسـەی مـردووت لێ مردووەو زۆر بـۆی خەمبارو بە پەرۆشی، خەمی مردووەكەت مەخۆ، مەڵێ بە تەنیایە، نەخێر ئیماندار هەرگیـز بە تەنهـاو غەریب و لێقەوماو نییە، لە كاتی سـەرەمەرگا كـە ئـاگای لە تۆ نامێنـێ، كە خەریكە بێهۆش دەبـێ و ڕووحەكەی جەسـتەی بەجێ دێڵێ، لەو كاتەدا فریشـتە بە چـوار دەوریەوەن و دڵنەوایی دەكەن ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْكُمْ وَلَكِن لاتُبْصِرون﴾ الواقِعَة ٨٥.

لەو كاتەدا كە تۆ وای لە لای سەری دانیشتوی و لە لایەوە دەڵێی (لاإله إلاّ الله) بۆ ئەوەی ئەویش لە دوا چركەسـاتەكانی تەمەنیدا بڵێ (لاإله إلاّ الله) و بەر ئەو موژدە بكەوێ، كە خۆشەویسـتمان فەرمووی: (مَنْ كانَ آخِرُ كَلامِهِ لا إلهَ إلاّ الله دَخَلَ الجَنَّةَ). ئا لەو كاتەدا فریشـتەكان بـە دەوریەوە دانیشـتوون، بەڵام چـاوی من و تـۆ نایانبینێ، ئەو فریشتانەی كە دەم و چاویان گەش و سپییەو دەڵێی ڕووناكی خۆرە دەدرەوشێتەوە، بەڵێ ئەو فریشتانە سێ موژدە دەدەن بەو ئیماندارەی كەوا لە سەرەمەرگدایە، گەورەترین و خۆشترین هەواڵ، لەو كاتەدا كە تۆ بۆ مردووەكەت دەگری كە لە دوا ساتی سـەرەمەرگیایەتی، بەزەییـت پێیدا دێتەوە، مردووەكەش كە خەریكە ڕۆحی دەردەچێ، سێ خەم و مەراقی گەورەی هەیە:

١-خەمــی ماڵ و منداڵی، بیر دەکاتــەوە دەبێ دوای خۆی و ژن و منداڵەکەی چیان بەسەر بێ، خوایە تۆ بڵێی ئیحتاج و موحتاج نەبن، ئەگەر هەژار بێ خەمی ئەوەیەتی کە دەڵێ خوایە خۆ کە من مردم کاســبکارێکیان نامێنێ، تۆ بڵێی ئەو منداڵە چاوگەشــانەم موحتاج و چاولەدەســت نەبن؟! فریشــتە ئەو خەمەی لەســەر لادەبات و پێی دەڵــێ: (لاتَحْزَنُــوا) خەمبار مەبە، خۆ کە تۆش لەناویاندا بووی، هەر خوا ڕزقی دەدان، هەر ئەوەندە بوو کە خوای گەورە تۆی بۆ کردبوو بە ســەبەبێکی ڕزق و ڕۆزی پەیداکردن، ئەگەر تۆی نانخۆر مردی (الــرَّزاق) کــە الله یە، هەر ماوە، ئیتر بەم موژدەیە ئەو کەســە ئەو خەمەی لەسەر لادەچێ.

٢-ئەو کەســەی کە خەریکە دەمرێ کە ســەیری ڕابردووی خۆی دەکات، دەیان و ســەدان گوناهی خۆی دێتەوە بەرچاو، شریتی ژیانی ڕابــردووی دێتــەوە بەرچاوی، لە خراپەکانی خۆی دەترســێ، خۆی بە خۆی دەڵێ: تۆ بڵێی بە هۆی گوناهەکانمەوە تووشــی جەهەننەم نەبــم، لــەو کاتەدا فریشــتەکە پێــی دەڵــێ: (لاتَخافُــوا) بەڵێ پێی دەڵــێ: (لاتَخَفْ) مەترســە، تۆ لە دنیادا زانیوتــە ئەمە تاوانە، وە کە ئەنجامت داوە خۆت بە شەرمەزار زانیوە، شانازیت بە گوناهەکەتەوە نەکــردووە، وتووتە: (أسْــتَغْفِرُالله) خوایە لێم خۆش بە، تۆ لە دنیادا وتووتــە: (الرَّحمن الرَّحیم) دەی خــەم مەخۆ دەچی بۆ لای خوایەك کە (الرَّحْمن، الرَّحیم، الکریم، الغَفُور، العَفُوُّ، التَّواب)ە. ئەی خوای گەورە

خــۆی نەیفەرمووە: (لاأجمَعُ عَلــى عبْدي خَوْفــيْنِ) هەرگیز دوو ترس لەســـەر بەندەی خۆم کۆناکەمەوە، تۆ مادام لە ژیانی دونیادا لە خوا ترســای، خۆت لە بێ، شـــەرعی پاراست تەنها لە ترسی خوا، لە دوای مردن ئیتر تووشـــی ترس نابی، هیچ خەم مەخۆو مەترسە، چونکە دەستنوێژەکەت، ســـوژدەکەت، ڕکوعەکەت، ڕۆژووەکەت، حەجەکەت، صەدەقەو خێرەکەی کە بە نهێنی تەنهاو تەنها لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا دەتبەخشی، هەموو ئەو هەنگاوانەی کە بۆ مزگەوتت دەهاویشت، قسە خێرەکانت، زەردەخەنە جوانەکانت، ڕووە گەشەکەت، ئیشکردنت بۆ خەڵکی لێقەوماوو داماو، نەخۆشـــی و سەرئێشـــی ژیانت، هەژاری و نەداریـــت، جەرگوســـوتاویت، خــەم و خەفەتت کە بۆ ئیســـلام و موســـڵمانان خواردت، ئەمانە هەمووی بوونە کەفارەتی گوناهەکانت، ئیتر خەمی ئەوەت نەبێ کە خوا سزات بدات، خوا لێت دەبووریٚ.

٣-مــوژدە هــەرە خــۆش و گەورەکــە: (وَأَبْشِـرُوا بِالْجَنَّــةِ) ئەو بەهەشتەی چەندین ساڵە داوای دەکەی و دەڵێی خوایە بەهەشتم پێ ببەخشــە. ئەوە تەماشـــا بکە وا وێنەکەی لەبەرچاوتدایە، لەم کاتەدا ئەو کەسە شوێنی خۆی لە بەهەشتا نیشان دەدرێ و ئەویش بە ئاسانی ڕووحەکەی دەردەچێ.. بەڵێ ئەم سێ موژدە گەورەی کە باسمان کرد، لە قورئاندا خوای گەورە باسی کردووە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلائِكَةُ أَلاَّ تَخَافُوا وَلا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ﴾ فُصِّلَتْ ٣٠.

بەڵێ ئیمانداران: فریشتەکانی خوا بەو کەسەی کە لە سەرەمەرگدایە دەڵێـــن: موژدەت لـــێ بێ بە ڕەحمەتی خوا بـــۆت، وە بە ڕەیحانەی بەهەشت، (وَرَبٌّ غَيْرُ غَضْبان) وە خوایەك کە تووڕە نییە لێت، بەردەوام فریشـــتە ئەو وشـــانەی پێ دەڵێت، بۆ ئەوەی خەمبار نەبێ و ترسی نەبـــێ تا ڕووحی دەردەچێت، ئەمەش مـــوژدەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بـــۆ ئەهلی ئیمان و تەوحید، کـــە فەرموودەیەکی صەحیحەو (صَحَّحَهُ الأَلْباني في صَحيح النَّسـائي: ١٧٢٩). هەزاران ســـوپاس بۆ خوای گـــەورە کە خەڵاتی ئیمانی پێ بەخشـــیوین، بەڵـــێ، ئەمە ڕەفیق و هاوڕێـــی یەکەم بۆ ئەو کەســـەی کە دەمرێ، لەم کاتەدا کە هێشـــتا لـــە باوەشـــی تۆدایە، بەڵام تـــازە ئەو چاوی نابینێ و گوێی قســـەی تۆ نابیســـتێ، ئیتر لەو ســـاتەوە هاوڕێی فریشـــتە دەبێ... پاشان کە خســـتمانە قەبرەکەوە، لەو کاتەدا لە بەرچاوی ئێمە زۆر بێکەس و غەریبـــە، بەڵام لەوێدا جارێکی تر فریشـــتە دێنەوە لای و دەبنەوە هاودەمی بۆ دڵدانەوەی تا ڕادێ لەگەڵ ئەم جیهانە، کە زۆر جیاوازە لەگـــەڵ دنیـــاو ئەم گۆڕە یەکـــەم مەنزڵی قیامەتە، ئەم فریشـــتانە دێنە لای و هەروەکو قســـەی خۆش و دواندن بۆ دڵخۆشبوون، وەکو خوێندکاری زیرەك کە چەندی پێ خۆشـــە پرســـیاری ئەو وانانەی لـــێ بکـــەی کە زۆرباش لەبەرنی، دڵی پێی خۆش دەبێ و مێشـــك و ڕوحی ئیســـراحەت دەکات، بە هەمان شـــێوەو بۆ هەمان مەبەســـت فریشتەکان لێی دەپرسن: خوات کێیە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ دینەکەت

کامەیە؟ برایانت کێن؟ خوشـــکانت کێـــن؟ چونکە مردوو لە قەبردا بیروهۆشـــی وەکو دنیا بۆ دەگەڕێتـــەوە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە وەڵامی حەزرەتی عومەردا کە پرسیاری کرد: ئایا لە گۆڕدا بیروهۆشم وەکو ئێستای دونیام کاردەکات و شتم وەکو ئێستا لەبیر دەمێنـــێ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نَعَمْ كَهَيْئَتِكَ اليَوْم) بەڵێ وەکو ئەمڕۆ هۆشـــت لای خۆت دەبێ، ئەم مردووە بەم پرسیارو وەڵامەی ناو گۆڕەکەی، کە گفتوگۆ لەگەڵ فریشـــتەکان دەکات ئاســـوودەیی و خۆشییەکی زۆری بۆ دێت..

دواتـــر: هاودەمێکـــی بـــەردەوام بۆ ئـــەو مردووە پەیـــدا دەبێت، کەپێغەمبـــەری خوا (ﷺ) بۆمان بـــاس دەکات و دەفەرموێ: مردوو لە گۆڕەکەیدا کەســـێکی ڕوخسار جوانی، جلوبەرگ و پۆشاك جوانی بۆنخۆشـــی ڕووگەشـــی دەموچاو نورانی دێتە لاو پێی دەڵێ: (أَبْشِـرْ بِرِضْوانٍ مِنَ اللهِ وَجَنّاتٍ فيها نَعيمٌ مُقيم) موژدەت لێ بێ خوا لێت خۆش بووەو بەهەشتێکی نەبڕاوەی بۆ ئامادە کردووی، ئەمە ئەو ڕۆژە بوو کـــە بە ئیمانداران بەڵێن درابـــوو، ئەمجا مردووە ئیماندارەکەش بە بینینی ئەم کەســـە ڕێکوپێك و جوانە زۆر دڵخۆش دەبێت و دەڵێ: باشـــە تۆ کێی کە ڕەنگ و ڕوخسارت ڕەنگی کەسێکە کە چاکەی پێ بێت؟! ئەو کەســـەش دەڵێ: (أَنا عَمَلُكَ الصَالِحُ) من کردەوە چاکەکانی تۆم، ئینجا قەبرەکەی بۆ دەکرێت بە باخێك لە باخەکانی بەهەشت و شوێنی هەمیشەیی خۆی لە بەهەشتدا نیشان دەدرێ، ئا لەو کاتەدا

ئەو کەسە مردووە لە گۆڕەکەیدا، ئەوەندە خۆشحاڵە کە هاوار دەکات: (دَعُوني حَتّى أَذهَبُ فَأُبَشِّرَ أَهْلي) توخوا مۆڵەتم بدەن و وازم لێ بێنن بــا لــەم گۆڕەم بچمە دەرەوەو موژدە بدەم بــە ماڵ و منداڵەکەم، بە ژنە چاو بە فرمێسکەکەم، ئەگەر ژن بێ ئەڵێ توخوا با بڕۆم موژدە بدەم بە مێردە باشــە موســڵمانەکەم، کە ئێستا بە مردنی من زۆر غەمبارە، با بڕۆم هەواڵی ئەم هەموو خۆشییە بگەیەنم بە دایك و باوکم، بە خوشــك و براکانم، بە منداڵــە جوانەکانم، کە هەتیوییان پێــوە دیارە، با بڕۆم و دەنگوباســی بەختــەوەری هەتاهەتاییان پێ ڕابگەیەنــم، کە ئیتر خەم بۆ من نەخۆن، چونکە ئیتر من هەرگیز نەخــۆش ناکەون، هەژار ناکەوم، زوڵمم لــێ ناکرێ، مافم ناخورێ، ترســم لەســەر نییە، خەمم نییە، با ئەوان خەمی من نەخۆن و لە خەمــی خۆیانــدا بن کە ئەوانیش بە ئیمانــەوە دونیا بەجێ بێڵن، هەروەکو ئیماندارەکەی سورەتی (یاسین) کە فەرموویەتی: (قالَ يالَيْتَ قَومي يَعْلَمُونَ بِما غَفَرَلي رَبّي وَجَعَلَني المُكْرَمينَ).

بەڵام لە وەڵامی ئەو داواکاریەدا پێی دەوترێ، جارێ ناتوانی بیان بینی و قسەیان لەگەڵ بکەی و بگەڕێیتەوە بۆ لایان، چونکە ئەوان هێشــتا لە دنیادان، هێواش و ئارام بە، بخەوە وەکو خەوی کەســێك کــە یەکەم شــەویەتی لە خانووی خۆیــدا دەخەوێت و خانووەکەی هەرچــی کەم و کوڕی بێت نییەتی، دوای ئەوەی چەندین ســاڵ بە کرێچییەتــی و ئــەم ماڵ ئەو مــاڵ و ئەم خانــوو و ئەو خانووی

کردووەو ژیانی زۆر تاڵ بووە، ئەم کەســە لە یەکەم شــەوی ناو ماڵ و خانووی خۆیدا چەند خۆشــحاڵە، ئەو مــردووە لەو قەبرەیدا بە ویستی خوا خۆشحاڵترە.

دوای ئەوە: کۆمەڵێ دۆســت و برادەری خۆی کە لەو گۆڕســتانە نێژراون، یاخود لە هەر جێگایەکی تر نێژراون، بەڵام ئەهلی ئیمانن و پێش ئەم مردوون دێن بۆ ســەردانی، لە فەرموودە خۆشە موژدە بەخشــەکەی پێغەمبــەری خــوادا (ﷺ) بۆ ئیمانــداران، کە هاوەڵی بەڕێز (بەڕائی کــوڕی عازب) گێڕاویەتیەوە، دەفەرمــوێ: (إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَصْعَدُ بِرُوحِهِ إِلى السَّماءِ فتأتيهِ أرواحُ المُؤمنينَ، فيَسْتَخْبِرُونَهُ عَنْ مَعارِفِهِمْ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ) قالَ الألباني في السلسلة الصَحيحَة (١٦٢٨) إِسْنادُهُ حَسَنٌ.

واتە: بە ڕاستی ڕوحی ئیماندار بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان و لەوێ ڕوحــی ئیمانــداران دێنە لای و هەواڵی خزم و نزیك و ناســیاوانی خۆیانی لێ دەپرســن، ئەوانەی کە هێشتا لەسەر زەوی ماون. ئەمجا دەفەرموێ: (فَلَهُمْ أَشَدُّ فَرَحاً مِنْ أَحَدِكُمْ بِغائِبِهِ يُقَدِّمُ عَلَيْهِ).

واتــە: ئەو مردووانەی کە پیش ئەم مردوون زۆر خۆشــحاڵن بەوەی کە ڕوحی ئەم ئیماندارەش چووە بۆ لایان، خۆشــحاڵتر لەوەی کەسێك خۆشەویســتێکی ماوەیەکی زۆرە لێی دوورەو ئێســتا پێی شاد بۆتەوە. ئەمجا لێی دەپرســن: ئــەرێ فلان کەس چی کــرد؟! ئەی فلان کەس چــی لێهات؟! هەندێکیان دەڵێن: (دَعُوهُ حَتَّى يَسْتَرِيحَ) وازی لێبێنن، با ماوەیەك پشوو بدات، چونکە تازە لە خەم و ئازاری دونیا ڕزگاری بووە،

پاشــان ئەم مردووە کە تازە بە خاك ســپێردراوە لە وەڵامیاندا کە لێی دەپرسن: ئەرێ فلان کەس چۆنە؟ (فَإذا قالَ: تَرَكْتُ فُلاناً في الدُنيا، أَعْجَبَهُمْ ذلِكَ). واتە: ئەگەر وتی: کە من مردم فلان کەس هەر لە دونیادا مابوو، بــەم هەواڵــە ئەو مردووانەی کە پێش ئەم مردوون، خۆشــحاڵ دەبن، چونکە دەڵێن هێشــتا لە دنیادا ماوەتەوەو کاری چاکە دەکات و دەڵێن: خۆزگە ئێمەش ئێســتا لە دونیادا بووینایــەو کاری چاکەی زۆرترمان بۆ ئەم شــوێنەمان بکردایــە..!! (وَإذا قالَ: إنَّ فُلاناً قَدْ مــاتَ. قالُوا: ماجيءَ بِــهِ إلَينــا، وَقَدْ ذَهَبَ بِرُوحِهِ إلى أَزواحِ الكُفَارِ) وە ئەگەر لە وەڵامدا وتی: بە ڕاســتی فلان کەس کە ئێوە لێی دەپرســن مــردووە، دەڵێن دەی مادام نەهاتووە بــۆ لای ئێمە کە جێگەی ئیماندارانە، ئەوە دیارە ڕوحەکەی بــراوە بۆ لای ڕوحــی کافرەکان. (ئــەم فەرموودەیە: أَخْرَجَــهُ البَزّار في المُسْنَد: (٨٧٤) وَحَسَّنَ إسْنادَهُ الألْباني في -الآيات البَيِّنات ص ١٠٥.

بەڵێ ئیمانداران: کە ئەم ڕاستی و حەقیقەتانەمان زانی لە بارەی ئەو کەسەی کە مردووە بە جێی هێشتین و بۆی مەحزون و غەمبارین، حەقە مرۆڤی موسڵمان هەر ئەوەندە بۆ مردووەکەی بڵێ: خوایە لێی خۆش بە، خوایە لە ڕیزی کاروانی ئیمانداراندا قبوڵی بکە، ئیتر کە ئیماندار بوو، دڵنیابە لە خۆشترین ژیاندایە، ئەمجا تۆ خەم بۆ ئەو مەخــۆ، خــەم بۆ خۆت بخۆ، ئەو حەزی دەکرد کە ئێســتا لە ژیاندا بوایەو چاکەی زۆرتر بکردایە دەی تۆ چاکەی زۆر بکە، زیاتر پابەند بە بە ئیسلامەوە.. بەڵێ هەر کەسێ دڵسۆزی مرۆڤە با ڕێی خواناسی

و دینداری نیشان بدات، با هەوڵی ئەوە بدات خەڵکی بە موسڵمانیەتی بژین و بە موسـڵمانیەتی بمرن، چونکە ئەوەی بە ئیمانەوە بژی و بمرێ، ئەوە چارەنووسـیيەتی کە باسـمان کرد، کەهەمووی خۆشـی و بەختەوەرییـە، کەواتە: هەر کەسـێك ببێتە هـۆی بێدین کردنی خەڵك، خەڵکی وا لێ بکات کە قیامەتی بەلاوە درۆ بێ، بڵێ: ئەو نانە نانە ئەمڕۆ لە خوانە، گاڵتەی بەناو گۆڕو زیندووبوونەوە بێت، ئەوە هەر دوژمنی مرۆڤ و مافی مرۆڤ و چارەنووسی مرۆڤە، با هەموو دونیاشـی بۆ کردبێ بە خۆشـی، کە کافر هیچ کات ئەوەش ناکات و لێـی چاوەڕوان ناکرێ... کەواتە: ئەوانەی دڵسـۆزی گەل و میللەتن، چـۆن دژایەتی ئەوانە دەکەن، ئەو کەس و گروپ و لا یەنانە دەکەن کە (ئاسایشـی نەتەوە) دەخەنە مەترسـییەوە، کە ژیانی چوار پێنج ڕۆژی ئەم دونیایەیان لێ دەشـێوێنن، دەبێ سەدقات دژی ئەوانە بن کە دەیانەوێ ئاسـایش و حەسـانەوەی هەتاهەتایی قەبرو قیامەتی خەڵکی بەبێ دین کردنیان بشێوێنن.

ئیماندارانی بەڕێز: وەکو پێشـتر باسـمان کرد، مردن لە دەرگای هەموو ماڵێك دەدات و هیچ کەس نییە ئازیزێکی لەدەسـت نەدابێ، بەڵام ئێمەی موسڵمان دەبێ هەڵوێستمان چۆن بێ کاتێ مردوویەکمان لـێ دەمرێ؟ ئایا وازی لێ بێنین و وا بزانین ئیتر ناوی سـڕایەوەو کۆتایی پێهات لە پەیوەندی لەگەڵمان، یان پەیوەندی لەگەڵمان هەر دەمێنـێ و ڕوحـی ئیماندار بە ئاگایە بە حاڵـی زیندووان؟ یاخود

بەردەوام شیوەن و گریانی لەسەر بکەین؟! یان هەر ئەوا بە دیاریەوە دابنیشین و مردووەکە بهێڵینەوەو جارێ بە خاکی نەسپێرین؟!

نەخێر، بەڵکو پێویستە هەرکە مردوو ڕوحی دەرچوو، چاوی لێك بنێین، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتی گیاندەرچوونی (ئەبو سەلەمە)دا چووە ژوورەوە بۆ لای و بینی چاوی ئەبڵەق بووەو کراوەتەوە، چاوی بۆ لێك نایەوەو فەرمووی: (إِنَّ الرُّوحَ إذا قبضَ تَبِعَهُ البَصَرُ). واتە: بێگومان گیان کە دەرچوو، چاویش شوێنی دەکەوێت، ئینجا هەندێ لە کەسوکاری (ئەبو سەلەمە) بە دەوریدا دەستیان کردە غەڵبەغەڵب و هات و هاوارو دوعا لە خۆکردن لە تاوی مردنی ئەو خۆشەویستەیان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لاتَدْعُوا عَلى أَنفُسِكُمْ إلاّ بِخَيرٍ، فَإِنَّ المَلائِكَةَ يُؤمِنُونَ عَلى ماتَقولُونَ)(رَواهُ مُسلِمٌ: ٩٢٠).

واتە: بەخێرو چاکە نەبێ دوعا لە خۆتان مەکەن، چونکە فریشتەکان ئامین لەسەر ئەو نزایانە دەکەن کە ئێوە دەیانڵێن، وەك ئەوەی بڵێن: دەستم بشکێ و کوێربم لە دوات، پاشان مردووەکە بشۆرێ و کفن بکرێ و پەلە بکرێ لە ئەسپەردەکردن و باخاکسپاردنیدا، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (أَسرِعُوا بالجَنازَةِ، فَإِنْ تَكُ صالِحَةً، فَخَيرٌ تُقَدِّمُونَها إِلَيهِ، وَإِنْ يَكُ سِوى ذلِكَ، فَشَرٌ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقابِكُمْ) أَخْرَجَهُ البُخاري: ١٣١٥، ومُسْلِم: ٩٤٤.

واتە: پەلە لە ئەسپەردەکردنی جەنازە بکەن، چونکە ئەگەر پیاوچاك بێ، ئەوە بەرەو خێر بەڕێی دەخەن، وە ئەگەر غەیری ئەوەش بێ،

ئەوە شەڕەو لە ملی خۆتانی دەکەنەوە، پاشان لەو شارو جێگەیە بینێژن کە تێیدا مردووەو نەیبەن بۆ هیچ جێگەیەکی تر، ئەگەرچی وەصیەتیشی کردبێت، چونکە دەبێتە مایەی دواخستنی ناشتنەکەی و ناڕەحەتی و ئازارو موشەقەت بۆ زیندووەکان. پێشەوا نەوەوی لە کتێبی (ألأذكار)دا دەفەرموێ: (وَإذا أَوْصَى بِأَنْ يُنْقَلَ إلى بَلَدٍ آخَر، لاتنفَّذ وَصِيَّتُهُ، فَإنَّ النَّقْلَ حَرامٌ عَلَى المَذْهَبِ الصَّحيحِ المُختارِ الَّذي قالَهُ الأَكْثَرون، وَصَرَّحَ بِهِ المُحَقِّقُونَ). واتە: ئەگەر مردووەکە وەصیەتی کردبوو بەوەر بیگوێزنەوە بۆ شارێکی تر، وەصیەتەکەی جێبەجێ ناکرێت، چونکە گواستنەوە لەسەر مەزهەبی ڕاستی پەسەندکراو کە زۆربەی زانایان فەرموویانەو بە ڕاشکاوی لێکۆڵەرەوان دانیان پێدا ناوە حەرامە.

هەروەها پێویستە بە شێوەیەکی ئاسایی خەڵك بە مردنی ئەم کەسە بزانن، نەوەك لەسەر مینبەرو لە ڕۆژنامەو تەلەفزیۆنەوە جاڕی بۆ بدرێ و بانگەوازی بۆ بکرێ، مەگەر چەند کەسێکی پێویست بە ئەندازەی ئەوەی کە بەشی ئەسپەردەو بەخاکسپاردنی بکەن، بە بەڵگەی ئەوەی لە (حوزەیفەی کوڕی یەمان)ەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (إذا مِتُّ فَلا تُؤذِنُوا بي أَحَداً، فإنِّي أَخافُ أَنْ يَكُونَ نَعْياً، وَإنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَنْهى عَنِ النَّعي). صَحيح سُنَن التِرمذي: ٧٨٦.

واتە: ئەگەر مردم کەس لە مردنەکەم ئاگادار مەکەنەوە، چونکە ئەترسم بانگەشەکردن بێ وە من گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) نەهی لە بانگەشەکردن بۆ مردوو دەکرد.. وە دەبێ نزیکانی

مــردوو، بــە تایبەت ئافرەتان ئاگادار بکرێن لــەوەی کە دووربن لە شــین و واوەیلاو لاواندنەوەو دەموچــاو ڕنینەوەو قژڕنینەوەو جل لەبــەر خۆ دڕاندن و ســینە کوتــان و هاوارکــردن، چونکە هەموو ئەوانە لە ڕەفتارو پیشەی نەفامین و تەواو لە ئیماندارەوە دوورن و پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی لە خاوەنەکەیان بەری کردووە وەك لەم فەرموودانــەدا هاتووە، پێغەمبەری خــوا (ﷺ) فەرموویەتی: (أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الجاهِلِيَّةِ لايتركونَهُنَّ: الفَخْرُ فِي الأَحْسـابِ، والطَّعْنُ فِي الأَنْسابِ، وَالإِسْتِسقاءُ بالنُّجُومِ، وَالنِّياحَةُ، وَقالَ: النَّائِحَةُ -إِذا لَم تَتُبْ قَبلَ مَوْتِها- تقام يَوْمَ القِيامَةِ وَعَلَيْها سِرْبالٌ مِنْ قطران، ودرعٌ مِن جرب) رَواهُ مُسْلِم: ٩٣٤.

واتە: چوار شــت لە ئوممەتەکەمدا ڕەفتــاری نەفامین و کۆڵیان لێ نادەن: شــانازیکردن بــە ڕەچەڵەکی باوو باپیرەوەو توانجدان لە ڕەســەنی یەکترو داوای باران کردن بە هیمەتی بورج و ئەستێرەو، هەروەها شین و شەپۆڕکردن بۆ مردوو، وە فەرمووی شینگێڕ ئەگەر پێش مردنی تەوبە نەکات، ڕۆژی دوایی لە حاڵەتێکدا دەوەستێندرێ کە پەشتەماڵی قورقوشمی تواوەی لەبەردایەو پێستەکەی دەبێتە زرێ و دەنووسێ بە لاشــەیەوە.. وە لە فەرموودەیەکی تردا، پێغەمبەری خــوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَيسَ مِنّا مَنْ لَطَمَ الخُدُودَ، وَشَــقَّ الجُيُوبَ، وَدَعا بِدَعْوى الجاهِلِيَّةِ) رَواهُ البُخارِيُّ: ١٢٩٤.

واتە لە ئێمە نییە کەسێك بە ڕوومەتیدا بکێشێ و یەخەی دادڕێ و وەك هــاواری ســەردەمی نەفامی هاوار بــکات، وە لە فەرموودەدا

هاتـــووە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێبەریبوونی خۆی دەربڕیوە لە ســێ کەس کە ئەمانەن (الصَالِقَة والحالِقَة والشَاقَة) رَواهُ البُخاريُّ: ١٢٩٦، و مُسلِم: ١٠٤

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێبەرییە لەو ئافرەتەی کە لە کاتی مردنی مردوودا هاتوهـــاوار دەکات و ئەوەی قژی خۆی دەڕنێتەوەو ئـــەو ئافرەتەش یەخەی خۆی دادەدڕێ و جلوبەرگی خۆی دەدڕێنێ وەکو پەرۆشـــی دەربڕین بۆ مردووەکەی!.. هەروەها واجبە لەســـەر موســـڵمانان، بە تایبەت ئەوانەی کە لە مردووەکە نزیکن کە هەموو تایبەتمەنـــدی و نهێنییەکانی پەردەپۆش بکـــەن، وەکو عەورەتی و ئەندامەکانـــی لاشـــەی، ئەگـــەر کەم و کوڕیەکیان هەبـــێ و لە کاتی شـــۆرین و کفنکردنـــدا دەربکـــەوێ، چونکە پێغەمبـــەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً، سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنيا والآخِرَة) رَواهُ مُسْلِمٌ.

واتە: هەرکەس کەموکوڕی موســـڵمانێك بپۆشێ، خواش لە دونیاو دوارۆژدا کەم و کوڕییەکانی بۆ دەپۆشـــێت، ئەمجا دوای کفنکردن و نوێژلەسەرکردنی بە جەماعەت و ناشتنی لە گۆڕستاندا یان لە هەر خاکێکـــدا کە لێی دەمرێ، بە شـــێوەیەکی وا گۆڕی بۆ هەڵبکەندرێ کە: قوڵ و فراوان بێ و هەتا هەموو لاشـــەی بە چاکی بشـــارێتەوەو حورمەتـــی پارێزراو بێت، کێلێکی بۆ بکرێ کە بزاندرێ ئەوە گۆڕی مردووە، ئەوەندەی گڵە زیادەکەی قەبرەکە خۆی لە کاتی پڕکردنەوەدا لێی زیاد دەبێ، سەر گۆڕەکە بەرزبکرێتەوە، نەك زیاتر، چونکە (أَبي

الهياج الأَسَدي) دەڵێ: پێشەوا (عەلی کوڕی ئەبوطالب) پێی وتم: (أَلا أَبعثك عَلى مابَعَثَني عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ؟! أَنْ لاتَدَعْ تِمْثالاً إِلاّ طمستَهُ، وَلا قَبْراً مشرفاً إِلاّ سَوَّيْتَهُ) رَواهُ مُسْلِم بِرَقَمْ: ٩٦٩.

واتە: ئایا بۆ شتێك ڕەوانەت نەکەم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی بۆ ڕەوانە کرد؟! ئەویش ئەوەیە: لە هیچ پەیکەرێك نەگەڕێی ئیللا شوێنەواری نەهێڵێ و لایبەری و هیچ قەبرێکی بەرز نەهێڵی ئیللا ڕێکی زەوی بکەیت.

هەروەها پێویستە لە گۆڕدا هیچ جۆرە هەڵبەستن و دیوارو مەزارو گەچکارێکی بۆ نەکرێ و لەسەری نەنوسرێ، مەگەر وەکو ئەمڕۆ کە گۆڕستانەکان زۆر فراوانن و پاش ماوەیەکی کەم لە ناشتنی مردوو، ئەوەندە مردووی تری لێ دەنێژرێ کە بە ئاسانی گۆڕەکەی مردووەکەت ناناسیتەوە، لەم کاتەدا دروستە ناوی مردووەکە لەسەر کێلی قەبرەکە بنوسرێ، جابر لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە: (نَهى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ يجصِصَ القَبْرَ، وأَنْ يَقْعُدَ عَلَيْهِ، وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ) رَواهُ مُسْلِم: ٩٧٠.

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی کرد لە گەچکاریکردنی گۆڕو دانیشتن لە سەری و دیوارکردن و خانووکردن و چەتری ئاسن کردن لە سەری.

# بەشی پێنجەم

الحَمـدُ للهِ رَبِّ العالَمـين والصَّلاة والسَّـلام عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّـد وَعَلى آلِه وصَحْبِهِ أَجْمَعين

ئیمانداران: لەگەڵ ئەوەدا کە وشـەی (مردن) بۆ گوێچکەی مرۆڤ خۆشەویسـت نییە، چونکە مانای دابڕان و کۆچ و فرمێسکە، کەچی زۆر جاریش وا دەبێ مرۆڤ ئاواتەخوازی دەبێت.

شاعیرو زانای پایەداری کورد (مەحوی) دەفەرموێت:

لە یاران بەجێ ماوم، نا بەجێ ماوم ئەجەل زووبە.

لەم قسووری ژینە بە مردن ئیستیعفا نەکەم چیبکەم.

بەڵـێ هەنـدێ جار لە قۆناغێکدا مرۆڤەکان دەگەن بە ئاسـتێك تەنهـا خۆزگەو ئامانجیان دەبێتە مـردن و هەروەك ئەوەی بۆ ئەو ژیابـن! دیارە مرۆڤ کە گەیشـتە تەمەنێك هیچ هاوڕێ و هاودم و هاوسـەردەمێکی نەما، ئیدی بە مانای وشـە تاقانەو غەریب دەبێت و هەمیشـە هەسـت بە تەنهایی دەکات و تینوێتی بە قەرەباڵغی و هاونشینی کەسانی ئەم ڕۆژگارە ناشکێت. ئەها کاتێك بە ساڵاچوویەك دەدوێنـی هەمیشـە دەم بە گلەییە لە ڕۆژگارو نەوەکانی سـەردەم،

زۆرجـــار ئەو بەتەمەنانە دەڵێن: پیاوەتی نەماوە، کوا دینداری؟ کوا شــەرم و حەیا؟ لە کاتێکا مامەی بە تەمەن هەموو ئەو چەمکانەی باســی دەکات بە پێناســەی ســەردەمی ژیانی خۆی قبوڵیەتی، نەك کات و پێوەرێکــی تــر، لەوانەیە لە دوێنێی ئەوانــدا ماچ نەکردنی منــاڵ و لەبــاوەش نەگرتنی ئەوپەڕی ڕجولــەت و پیاوەتی بووبێ! کەچــی ئەمــڕۆ ئەو شــتێکی تر دەبینێــت، دەکرێ بڵێیــن ئەو بە زمانێك قسە دەکات کە مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە باش یان هەر لێی تێناگەن، چاوەکانی ئەو بە وێنەکانی ئێســتا ڕۆشن نابن، ئاخر کەی ســەیرکردنی کوڕە لاوێکی کورد بە قاتێکی مرادخانی و کوڵەباڵ و مشــکیەکی گوڵینگەدارو جوتێ سمێڵی سووســنی، لەگەڵ گەنجێکی پانتۆڵ تەســکی، سمێڵ تاشراوی، سەکسووك بە چەنەگەو قژو سەر تاڵتاڵ کراوی شــەلاڵ بە جێڵ وەکو یەك وایە؟! بۆیە مەحوی ئاســا ئاواتەخوازی مردنە، وەك وەســیلەیەك بــۆ ڕزگاربوونی لە ژیان و گەیشــتنی بە هاوڕێ و خۆشەویســتانی، کەوابێ مردنیش عاشــقی خۆی هەیە. نوسەرێك دەڵێ: هەرگیز لەبیرم ناچێت دوای یەك دوو هەفتە کۆچی دوایی ئافرەتێك کە دایکی چەند مناڵ بوو، سەردانی ئــەو ماڵەم کرد، ئەو پورەیان کە بــۆ چاودێری لای مناڵەکان بوون وتــی: دوێنێ نیوەشــەو ئەم بچووکەیان هەســتا لە خــەوو دەگریا، منیش پرسیم: بۆ دەگری ڕۆڵەگیان؟ وتی: حەزم لە مردنە!! منیش شڵەژام و وتم: تۆ جارێ مناڵی چۆن دەبێ وابڵێی؟! وتی: ئاخر بۆیە

حـــەزم لەوێیە چونکە دوێنێ منداڵەکانـــی کۆڵان وتیان: ئیتر دایکت نایەتـــەوەو مـــردووە!! وتی: پورێ منیش دەچم بـــۆ مردن، چونکە دایـــە لەوێیـــە، کە ئەمەی بۆ گێڕامەوە منیش لە ناخەوە ســـوتام و چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك، ئیتر ئەو کات زانیم دەشێ مردنیش ببێتە ژووان و عاشقانی لێکدابڕاو کۆبکاتەوە، ئەوسا زانیم مردنیش عاشـــقی خۆی هەیە، تۆ بڵێـــی کاتێك لە ناوەڕاســـتی کاردای کردن دەســـتت لێ هەڵبگرێت تا کارەکەت تەواو دەبێت، یان ئەو کاری بە سەرقاڵی تۆوە نییە؟ کەواتە: تۆش وریا بەو با سەرقاڵیەکانی ژیان و ژینگەی ئامادەکاری بۆ ئەو سەفەرەت لە بیر نەبەنەوە، ئاخۆ دەبێ مردن لەســـەر تێروپڕی خۆشـــتر بێت یاخود پرســـیەتی؟ یان هیچ جیاوازییەکیـــان نییە؟! ئایا پرســـەو تەعزیەکەت قەرەباڵغ بێت یان ئاســـایی بێت بۆ مردنەکەت خۆشترە؟! ئاخۆ دوای مردنی تۆ زۆری پێ دەچێ تاکو قیامەت دادێ؟ یان گرنگ ئەوەیە کە تۆ مردی واتە قیامەتی تۆ هات! ئەمانەو چەندانی تر شـــتێك لە ئەصڵی مەبەست ناگۆڕن، بێگومان دەبێ ئێمە هەر بمرین، چونکە پێکهاتەی لەشـــمان بەرگەی زەمەنێکی دیاریکراو دەگرێ، واتە ئەم گۆشت و خوێنە هەر بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەرگەی مانەوە دەگرێ، بۆیە لە دوای مردن کاتێك زیندوو دەکرێینەوە بۆ ژیانی هەمیشەیی، زۆر جار وا دەبێت مرۆڤ ژیان و مردنی وەك یەك لێ دێت، بە شـــێوەیەکی تر مردنی هەر مرۆڤێکیش ئەو کاتە دەست پێ دەکات کە هیواو ئاواتی لەدەست

دەدات و بە ناچاری چاوەڕیی مردن دەکات، کەواتە ژمارەیەکی زۆرن ئەو زیندوانەی لە ناخدا مردوون و لە کاروان سەرای ژیان، چاوەڕوانی زەنگی سەفەر دەکەن، ئەوان ئەوەندە نائومێد بوون هیچیان لەدەست نایــە بــۆ ژینگەو ژیان، تەنانەت پێیان حەیفــە، یان هەر بە ڕەوای نابینــن ئەزموون و سەرگوزشــتەکانی ژیانی پــڕ مەینەتیان، وەك وەفایان خزمەت یان هەروەك یادگارییەك بۆ نەوەکانی دوای خۆیان جیٚ بهێڵن، پێدەچیٚ ئەو جۆرە مردنە زۆر ناخۆش نەبێت کاتێك تۆ دەمری هێشتا ژینگەو ژیان کاریان پێت ماوە، دونیا چاوی لە دواتە نەك تۆ کارت بە ژیان مابێت و چاوت لە چڕوچاوو خەندەی لێوی چرچ و لۆچی پیرە دونیا تەمەن ملیۆنان ساڵە بێت. (مەحوی) زۆر جوان بە خۆماندا دەشــکێنێتەوەو لە بەردەم بیٚ نەفسیماندا ڕامان دەگرێت و دەڵیٚ:

نەڵیٚ مەردم کە دونیا پشتی لەو، ئەو ڕوو لە دونیا بیٚ.
پورە زاڵە، بۆچی پیری زاڵی بیٚ ڕەزا نابیٚ..

واتە: ئەگەر تۆ خۆت بە ڕۆســتەمی زاڵ دەزانیت و بە جوانی و هێــزو لێهاتووییت دەنازی و بە خۆت دەڵێی مەرد، ئەوا دونیا وەك ئافرەتێکی پیری تەمەن ملیۆنان ســاڵ کە گەنجیەتی خۆی لەدەست داوە، ئینجا تۆ لە خۆی ناگریٚ و پێت ڕازی نییە، دەی کەی مەردی ئاوایە تۆ بە دوای یەکێکدا ڕابکەیت و کچی ئەو هەر حیســابت بۆ نەکات و ئاوڕت لیٚ نەداتەوە.

نووسەرێك دەڵێ: جاران كە منداڵ بووین و ماڵمان لە شار بوو، كاتێك بڕیـــار دەدرا بەیانی بچینەوە بۆ گوند، بـــۆ جێگەی گڕوگاڵی منداڵی و مەوتەنی خۆشەویســـتی و باوك و باپیران، ئەو شەوەمان لێ دەبوو بە كابوس و بە چیایەكی ســـەخت، تەنها تونێل بۆ دەربازبوون نووســـتن بـــوو، واتە هەرگیز بەرگەی ئەو چاوەڕوانییە زۆرەمان نەدەگرت، بۆیە كـــە خەومان لێ دەكەوت وەك چەند چركەیەك وابوو، كاتێك چاومان دەكـــردەوە ڕاســـتەوخۆ لە بەردەم خۆزگەی بەیانیـــدا بووین، كەواتە: ئەگەر مردن بە ئیختیاری خۆشـــمان بوایە، بەرگەی چاوەڕوانی ڕۆژی قیامەت و حەشـــرو حیســـابمان نەدەگرت، بۆیە مردن باشترین تونێلە بۆ هەرچی زووتر گەیشتنە بە بەهەشت و خۆشیەكانی، ئێمە قەرزاری خەڵاتی مردنین، ســـەد شـــوكر بۆ تۆ خوایە، ئەگەر مردن نەبوایە بە ڕاستی ژیان بە پەندی دەبردین، هەراسان و سەرگەردانی دەكردین، بێ گوێدانە پیری و چرچ و لۆچی و دەردەداریمان بە دوای خۆیدا بۆ ئەو ڕێگا دوورەی قیامەت ڕای دەكێشاین، كەوابوو مردن پردی پەڕینەوەیە، تونێلی گەیشتنە بە دونیاكەی ترمان، بۆیە دەشێ بڵێین مردن لە یەك كاتدا هەم كۆچە و هەم لەدالیكبون، هەركوەكو كۆساری شاعیر دەڵێ:

(لە ژیانی دونیا لەدایك بوون دوو بوونە.. یەك لە داوێن و ئەوی دی بۆ گۆڕچوونە).

ســـەرەنجام پێشەوامان حەزرەتی محەمەد (ﷺ) ڕێنماییان دەكات بـــۆ چۆنیەتی مامەڵەكردنمـــان لەگەڵ ئەم ژیـــن و مردنە، هانمان

دەدات لــە پێنــاوی ئامانجە مەزنەکەمان (عیبــادەت) کە لە پێناویدا نێردراوین بۆ گەشــتەکەمان لەســەر زەوی، بێوچان لە هەوڵی شەوو ڕۆژدا بین، بەڵکو هەموو جوڵەو تێکۆشــانێکمان بکەین بە عیبادەت، فێرمــان دەکات ئەگــەر یەکێك لە ئێمە نەمامێکی بەدەســتەوە بوو، خەریکی ناشــتنی بوو، لەو کاتەدا هەواڵــی تێکچوونی دونیاو هاتنی قیامەتیــان پێدا، با نەمامەکە فڕێ نەدات، بەڵکو هەر بیچێنێت، ئەم ســووربوونە بۆ جوانی، بۆ پاکی ژینگە، بــۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی، فێرمــان دەکات تا نۆرەی مردن دەمانگاتێ لە چاکســازی و ئاوەدانی و گوفتاری شــیرین و کرداری ڕەنگین نەوەســتین، بــا لە دنیادا زۆر مانــدوو بیــن لە ئەنجامدانــی کاری چاکەدا، تا بەڵکو لە وێســتگەی مردندا بە ئارامیەوە خەوێکی خۆش بکەین و پشــوویەك بدەین، بۆ زووتــر گەیشــتن و گەڕانەوەمان بۆ هەوارگــەی لێوانلێو لە زینەت و شــادی، هەوارگەکەی (بابە ئادەم و دایــە حەوا)مان، کە هەر ئەوێش وڵاتی ڕەسەن و بنچنیەیی خۆمانە، چونکە لە بنچینەدا خەڵکی وڵاتی ڕازاوەی باغ و باغات و ڕووبارو سەوزایین، کە ئەویش بەهەشتی پان و بەرینی خوای میهرەبانە، بۆیە لەم گەشتە بچووکەی سەر ئەم بستە زەویەشــمان، هەر حەزمان لە شوێنێکە کە ڕووبارو دارو سەوزایی لێ بێت و تۆزقاڵێك شێوەی لە وڵاتی ڕەسەنی خۆمان (بەهەشت) بکات..

ئیماندارانــی بەڕێز: دوای ئەوەی مرۆڤ لە دنیا دەرچوو، ئەوەی سوودی پێ دەگەیەنێ لە دوای ڕوح دەرچوونی ئەمانەن:

١-نوێژکــردن لەســەر جەنازەکــەی و دوعاکردن بــۆی لە لایەن ئەو کەســانەوە کە نوێژی لەســەر دەکەن، پێغەمبــەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مامِن مَيِّتٍ يُصَلّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ المُسـلِمينَ يَبْلَغُوا أَنْ يَكُونُوا مائة، فَيشْفَعُونَ لَهُ إلاّ شُفِّعُوا فيهِ) رَواهُ مُسْلِم في (الصَّحيح): ٢١٩٥.

واتە: هەر موسڵمانێك بمرێت و کۆمەڵێك لە موسڵمانان کۆببنەوە کە ژمارەیان بگاتە ســەد کەس و تکای بۆ بکەن لای خوا، بێگومان خوای گەورە تکاکەیان لێ وەردەگرێت.

٢-شــایەتی بۆ دان و باســکردنی مردووەکە بــە چاکە لە لایەن خەڵکییــەوە: لە عومەری کوڕی خەتابــەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (أَيُّما مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ إلاّ أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ) واتە: هەر موسڵمانێك چوار موسڵمان شاهیدی بۆ بدەن کە چاکە، خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە. (قالَ: قُلْنا، وَثَلاثَة؟ قال: ثَلاثَة، قال: قُلْنا وَإِثْنانِ؟ قال: إِثْنانِ، وَلَمْ نَسْأَلْهُ عَنِ الواحِدِ) رواهُ البُخاري في الصَّحيح: ٢٦٤٣.

واتــە: حەزرەتی عومەر دەفەرموێ: ئێمــەش وتمان ئەی ئەگەر کەسێك بمرێ و سێ کەس شاهیدی بۆ بدەن کە بە ڕاستی کەسێکی چــاك و خوانــاس و بەکەڵك بووە، ئایا ئەویش هــەر خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ سێ کەسیش قبوڵن بۆ ئەو شــایەتیدانە لای خوا، پاشــان وتمان: ئەی ئەگەر دوو کەس شاهیدی چاکەی بۆ بدەن، هەر خوا لێی خۆش دەبێ و دەیخاتە بەهەشــتەوە؟! فەرمووی: بەڵێ دوو کەســیش هەر شاهیدییان بۆ

ئــەو مــردووە بە چاکە قبوڵە لای خوای گــەورە، حەزرەتی عومەر دەفەرموێ: بەڵام پرسیاری یەك كەسمان لێ نەكرد..

ئای خۆزگە بەو کەسەی کە لە دوای مردنی موسڵمانان و خواناسان کە تەنها لەبەر خوا خۆشــیان ویســتووە شاهیدی حەقی بۆ دەدەن، چونکــە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (المُؤمِنُونَ شُـهَداءُ اللهِ فِي الأَرْضِ) رَواهُ البُخاري فِي الصَّحيح: ٣٦٧، وَمُسْلِم: ٩٤٩.

واتە: خاوەن باوەڕوان (ئیمانداران) شاهیدانی خوان لەسەر زەویدا..

٣-ســێیەم شت کە ســوود بە مردوو دەگەیەنێ، کە زیندوان بۆی بکــەن، بریتیە لە: دوعای موســڵمانان بــۆی دوای ئەوەی دەخرێتە گۆڕەوەو دادەپۆشرێ، صەحابەکان دەفەرموون: هەر کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ناشتنی مردوویەك تەواو بوایە دەیفەرموو: (إِسْتَغْفِرُوا لِأَخيكُمْ وَسَلُوا لَهُ التَّثبيتَ، فَإِنَّهُ الآنَ يسأَلُ) حديث صَحيح، صَحَّحَهُ الشَّيخ الأَلباني فِي صَحيح سُنَن أَبي داود: ٢٧٥٨.

واتە: داوای لێخۆشبون بۆ ئەم برایەتان بکەن، وە داوای بۆ بکەن تا وەڵامی دوو فریشــتەکە بداتەوە، چونکە ئە و ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت.. کەواتە: ئەو مردووە زۆر زۆر سوودی لێ دەبینێت و دوعای زیندوانــی پێ دەکات بۆ گۆڕەکەی وە لەوانەیە ســزا کەم بکرێتەوە یان لاببرێت لە ســەری (وَاللهُ أَعلَم) وە ئەو موســڵمانەی دووعا بکات بۆ برایەکی تری موســڵمانی، ئەوا پلە بەرزی و سەربەرزییەکی زۆر بــۆ خۆی بەدەســت دێنێ لە ژیانــدا، وەکو پێغەمبــەری خوا (ﷺ)

دەفەرموێت: (مَنْ استَغْفَرَ لِلمُؤمِنينَ والمُؤمِناتِ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤمِنٍ وَمُؤمِنَةٍ حَسَنَةً) حديثٌ حَسَن. حَسَّنَهُ الألباني في صَحيح الجامِع: ٥٩٠٢.

واتە: هەر کەسێك داوای لێخۆشبوون بکات بۆ خوشك و برایانی ئیمانداری، ئەوا بە ژمارەی هەموو بڕوادارێکی براو خوشکی چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، هەر بۆیە زۆر چاکەمان دەست دەکەوێ کاتێ دوعا دەکەین و دەڵێین: (ألَلهُمَّ اغْفِرْ لِلمُؤمِنينَ والمُؤمِناتِ، والمُسْلِمينَ والمُسْلِماتِ).

بەڕێزان: لێرەدا پێم خۆشە فەرموودەیەکی گەلێك دڵخۆشکەرو موژدەبەخش بۆ ئەو کەسانە باس بکەم کە گۆڕ بۆ مردوو هەڵدەکەنن لە پێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ حَفَرَ لِمَيِّتٍ قَبْراً فاجَنَّهُ فيهِ، أجرى اللهُ لَهُ مِنَ الأَجْرِ كَأَجْرِ مَسْكَنٍ أَسْكَنَهُ إلى يَوْمِ القيامَةِ) رواهُ الحاكم ١/٣٥٤. وَصَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الترغيب: ٣٤٩٢.

واتە: هەر کەسێك گۆڕێك بۆ مردوویەك هەڵ بکەنێت و تیایدا بیشارێتەوە، خوا پاداشتی ئەو کارەی بۆ بەردەوام دەکات، وەك پاداشتی یەکێك خانوویەکی بۆ هەژارێك کردبێت، وە تیایدا نیشتەجێی کردبێت تا ڕۆژی قیامەت!!

ئیمانداران: ئایا مردوو بە ئاگایە بە حاڵی زیندوان لە دوای خۆی؟! زانایان بۆچونی جیاوازیان هەیە لەم بارەیەوە، بەڵام زۆربەیان دەفەرموون: مردوو بە ئاگایە بە حاڵی زیندووان، باشترین بەڵگەش

لە بەئاگابوونی مردوو لە زیندوو، وەصیێتەکەی (ثابتی کوڕی قەیس) ە، لە کچەکەیەوە دەفەرموێت: سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس کە گوێــی قورس بوو، وتاربێــژو زمان پــاراوی پێغەمبەری بەڕێز بوو (ﷺ)، ئەو پایەبەرزەی شــەهید بوو لە جەنگی یەمامەدا، دوای ئەوەی کە موسڵمانان سێ جار بەزین زۆر تووڕە بوو، کفنی پۆشی وە چاڵی بۆ خۆی هەڵکەندو فەرمووی: بە خراپترین شــێوە بەرامبەر کافــران دەجەنگن، ئێمە هەرگیز کە لە خزمەت پێغەمبەردا بووین، ئاوا نەدەجەنگاین دژ بە دوژمنانی خوا، وە شەڕی کرد تاکو شەهید بوو، کە شــەهید بوو قەڵغانێکی گرانبەها بەســەر ســنگییەوە بوو، بۆ ئەوەی شمشــێر کاری تێ نەکات، دوای شــەهیدبوونی یەکێك لە موســڵمانان هات کە بینی کەســی لێ نییە، ئەویش قەڵغانەکەی لێ کردەوەو لێی دزی!! ســابتی کوڕی قەیســیش هاتــە خەوی یەکێك لــە ســەربازەکان دوای مردنی بــە ڕۆژێك و فەرمووی: بــە ئاگابە وەســیەتێکت بــۆ دەکەم بەڵام نەکەی بڵێی ئەمــە خەوەو ئەنجامی نەدەیــت و جێبەجێی نەکەیــت، من دوێنێ کە کــوژراوم یەکێ لە موسڵمانان تێپەڕی بە لامداو قەڵغانەکەی دزیم کە پێمەوە بوو، وە ئەو جێگەیەشــی کە لێی دەحەوێتەوە لەوپەڕی ســەربازگەکەومیەو لەوێ شــاردوویەتیەوە لە بەردەمماڵەکەشــی ئەســپەکەی بە یەك قاج بەســتۆتەوەو قەڵغانەکەی منیشــی خســتۆتە ژێــر مەنجەڵێك و مەنجەڵەکــەش کۆپانی وشــترەکەی داوە بەســەریدا، بڕۆ بۆ لای

خالیدی کوڕی وەلید، کە سەرۆکی سوپایە ئەم خەوەی بۆ بگێڕەوەو پێی ڕابگەیەنەو پێی بڵێ: با بچێت ئەو قەڵغانەی لێ بسەنێتەوە، تۆش ئەگەر چویت بۆ شاری مەدینە بۆ لای جێنشینی موسڵمانان ئەبابەکر، ئاگاداری بکەوەو بڵێ: سابت وتویەتی من ئەوەندە قەرزارم و ئەوەندەش پارەم هەیە لای خەڵك، وە فلاّن کەسیش لە بەندەکانم ئازاد بێت، نەکەی بڵێی ئەمە خەوەو پشتگوێی بخەیت و جێبەجێی نەکەیت، پاشان سەربازەکە لەو خەوەدا بە ئاگا هات و چوو بۆ لای خالید و خەوەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش چەند کەسێکی نارد بۆ لای ئەو شوێنەی کە سەربازەکە قەڵغانەکەی لێ شاردبۆوە، چۆن باسی کردبوو بەو شێوەیە بوو، دوای ئەوە ئەو کەسە خالیدی کوڕی وەلید ڕەوانەی کرد بۆ لای جێنشینی موسڵمانان ئەبوبەکری صدیق، ئەویش خەوەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەبوبەکر وەسیەتەکەی بۆ جێبەجێ کرد، وە دەفەرموێت: هەرگیز نەمان بیستووە مردوویەك لە دوای مردنی وەسیەتەکەی بۆ جێبەجێ کردبێت، وەکو چۆن وەسیەتەکەی سابت جێبەجێ کرا. (أَخْرَجَهُ الطَّبَراني في المعجم الكَبير: ١٣٢٠).

بەڵێ ئیمانداران: یەکێ لەو پەیوەندییانەی کە لەگەڵ مردووەکەمان دەمانمێنێ بریتییە لە سەردانی گۆڕی مردوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيارَةِ القُبُورِ فَزُورُوها) رَواهُ مُسلِم بِرَقَم: ١٩٧٧.

واتە: جاران دەمگوت مەچن بۆ سەردانی گۆڕەکان، بەڵام ئێستا ڕێگاتان پێ دەدەم کە سەردانی گۆڕی مردووەکانتان بکەن..

بەڕێزان: ئایا مردوو ئاگادارە بەوەی کە کەسوکارو خۆشەویستانی سەردانی دەکەن؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: کاتێ چوونە سەردانی گۆڕستان بڵێن: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ أهْلَ الدِّيارِ مِنَ المُؤمِنينَ والمُسْلِمينَ، وإنَّا إنْ شاءَاللهُ تَعالى بِكُمْ لاحِقُونَ، نَسألُ اللهَ لَنا وَلَكُمُ العافِيَة) رَواهُ أحمد في المُسْنَد، ج ٥، بِرَقَم: ٢٣٠٨٩.

ئەوەی لەم فەرموودەیەوە وەری دەگرین ئەوەیە کە:

١-کافی خیطاب لە (السَّلامُ عَلَيْكُمْ) بۆ سەلامکردنە لە کەسێکی زیندووی بەئاگا، دەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمان دەستەواژەی (السَّلامُ عَلَيْكُمْ)ی بۆ مردووەکان بەکارهێناوە.

٢-وتەی (أهْلِ الدِّيار)، بە زۆری بۆ شوێن و شارێکی ئاوەدان و فراوان بەکاردێ، کە خەڵکێکی تێدا نیشتەجێیەو جموجوڵی تێدا دەکەن و ژیانی لەسەر دەگوزەرێنن، خۆ هەمووومان دەزانین کە وشەی (الدِّيار) بە شارێکی وێران و چۆڵ و هۆڵ و بێ مرۆڤ ناوترێ دەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ گۆڕستان وشەی (الديار)ی بەکارهێنا، بەڵێ چەند وشەیەکی جوانە، چونکە بە ڕاستی گۆڕستان ماڵی ڕاستەقینەمانە، ئەوێ (مَعْمور)، ئێرە، ئەم دنیایە (مَهْجُور). ئەوە نییە دەڵێین: (وَإنَّا إنْ شاءَ اللهُ تَعالى بِكُمْ لاحِقُون) ئەوان نایەنەوە بۆ لای ئێمە، بۆ ئەم دونیا فانییە، ئەوە ئێمەین کە دەبێ بچین بۆ لای ئەوان.

بەڵێ چەندین فەرموودەمان هەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام

هاتووچــۆی گۆڕســتانی بەقیعی کــردووە، وە پێــش وەفاتی بە چەند ڕۆژێك سەردانی گۆڕستانی بەقیعی کرد، وە سەلامی لێ کردن و دوعای بەخێری زۆری بۆ کردن، وە زۆر جار دەچوو بۆ ســەردانی شــەهیدانی ئوحود، لە پاڵ شاخی ئوحوددا، وە بۆیان دەگریاو سەلامی لێ دەکردن، وە دوعای بەخێری بۆ دەکردن. دەی ئەگەر ئەمە سوودی نەبێ و مردوو ئاگای بەم ســەردانە نەبێ، چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی خۆی بە شتی بێسوودەوە بەسەر دەبات؟! (فَتاوی برید الإسلام، ص ٢٣٧).

وە هەندێ کەس وا حاڵی بوون کە ســەردانی گۆڕستان و مردووی ئازیــزت هەر تا ماوەیەکــەو ئیتر وازی لێ دەهێنــرێ، بەڵام ئەمە پێچەوانەی ڕێبــازی پێغەمبەرە (ﷺ) چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو نمونەی عەمەلی پێشکەش کردین و تێی گەیاندین کە مردووی خۆشەویســت و هەمیشــە لە یاد، ئەگەر چەندین ســاڵیش بەســەر مردنیدا تێپەڕی کردبێ، هەر زیارەت و سەردانی گۆڕەکەی دەکرێ..

نمونەی یەکەم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەمەنی (٦) ساڵان بوو، لە ئامێزی گەرمی دایکیدا بوو، بۆنی ئەو باوکەش کە چاو نەیبینی، کە دەستی سۆزی باوکایەتی بەسەردا نەهات، ئەو سۆزەشی، ئەو نازەشی بە ســنگی دایکی بەخشــی بوو، دایکی وەفــاداری (ئامینە خاتوون). حەزرەتی محەمەدی تەمەن (٦) ســاڵانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و بە هاوڕێیەتی (أُمِ أَیمَن) لە مەککەوە ڕۆیشــتن بۆ مەدینە بۆ ســەردانی گــۆڕی عەبدوڵڵای هاوســەری و باوکی محەمــەدی تاقانەی، وە بۆ

ئەوەش کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر لە منالّییەوە مالّی خالّەکانی باوکی بناسێ، ئەوە وەفادارییە، بەلاّم لە گەڕانەوەدا لە دووری (١٥٠) کـم لە مەدینـەوە لە (أَبْواء) ئامینە نەخـۆش کەوت و ئیتر قاچی زەوی نەدەگرت و کەوت.

پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەو تەمەنە کەمەوە کە تازە (٦) سـالاّن بـوو، بە دەوری دایکیـدا دەهاتو دەچوو، دەگریا، بەلاّم قەدەری خوا وابـوو هەر لـەو بیابانە چۆڵـەدا (ئامینە خاتـوون) وەفاتی کردو هاوڕێی وەفاداری (أُمُ أَيمَن) بەدەست و بە قاچ و بە دار لمی بیابانی بۆ هەڵکەندو ئامینەی دفن کردو ناشتی و پێغەمبەری خواش (ﷺ) زۆر بۆ دایکی دەگریا، پاشـان (أُمُ أَيمَن) لە باوەشـی گرت و هێنایەوە بۆ مەککە بۆ لای (عبدالمُطَلب)ی باپیری. پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشـە مەرگـی دایکـی گۆڕەکەی لەبـەر چاو بوو، پێغەمبـەری خوا (ﷺ) گـەورە بـوو، بوو بە پێغەمبەر، بوو بـە خاوەنی چەن ژن و منالّ، دوای نزیکەی (٥٠) سـالّ، لە کاتی فەتحی مەککەدا، چووە سـەردانی گـۆڕی دایکی و فەرمـووی بە هاوەلاّنی، ئەمە گـۆڕی دایکمە، ئیتر لەسـەر گۆڕەکـەی دانیشـت و زۆر زۆر گریا، هەرچـی صەحابە لە حزمەتیدا بوون، هەموو دەستیان کرد بە گریان. تەماشا کەن دوای (٥٠) سالّ هێشتا گۆڕی دایکی هەر لە بیرەو سەردانی دەکات.

ئایا کێ لە خەڵکی ئەمڕۆ دوای (١٠) سـالّ سەردانی گۆڕی باوک و دایکی دەکات؟!

نمونـــەی دووەم: لـــەو کاتەدا کە بۆ ماوەی ســـێ ســـاڵ گەمارۆی ئابـــووری خرایە ســـەر پێغەمبـــەری خواو (ﷺ) هاوەڵانی لە شـــیوی (ئەبو طالب)دا، لە کۆتاییدا خاتوو خەدیجەی هاوســـەرو پشتیوان و یەکەم ئیمانداری ئەم ئوممەتی ئیســـلامە وەفاتی کرد. پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) زۆر بـــۆی بە پەرۆش بـــوو، دوای نزیکەی (١٠) ســـاڵ لە وەفاتـــی خاتـــوو خەدیجە، لە کاتـــی فەتحی مەککەدا، ئـــا لەو کاتە جەســـاس و چارەنووســـازەدا، کە دەیان وەفد دەهاتنە خزمەتی و خەڵکی پۆل پۆل موســـڵمان دەبـــوون، عەرزیان کرد: با خانوویەکت بۆ دابیـــن بکەین، فەرمووی: نا، خێمەیەکم لە تەنیشـــت گۆڕەکەی خەدیجەوە بۆ هەڵ بدەن، ئەمجا چووە ســـەر گۆڕەکەی و ســـەلامی لـــێ کردو دوعـــای زۆری بۆ کردو زۆر مەحزون بوو، فرمێســـك بە خـــوڕ بـــە چاویدا دەهاتە خـــوارەوەو لە ڕیشـــی موبارەکی دەکەوتە خوارەوە، دەیفەرموو: ئەی خەدیجە، هەموو کاتە خۆشـــەکانی ژیانم لەگەڵ تۆدا، هەموو بیرەوەرییە شیرینەکانم لەبەرچاوە، فەرمووی: ئەی خەدیجەی خۆشەویستم، ئەی هاوژینی دڵسۆزم، هەزاران هەزار ڕەحمەتی خوات لێ بێ، خوای گەورە جەزات بداتەوە بەرامبەر ئەو هەموو خزمەتەی بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی و موسڵمانانت کرد.

ئەمەیـــە خۆشەویســـتی و وەفـــاداری بـــۆ ژن و هاوســـەری ژیان، خۆشەویستی ڕاستەقینە ئەوەیە کە دوای (١٠) ساڵ لە مردنی هێشتا کـــە دەچێتە ســـەر گۆڕەکەی دەڵێی ئەو ســـاتەیە کە مـــردووە، ئایا

پیاوانی موسـڵمان، ئەوانەی کـە خێزانیان مردووە ئاوا وەفادارن بۆ هاوسەری ژیانیان و ئاوا سەردانی گۆڕەکانیان دەکەن؟!

ئیمانداران: ئافرەتانیش بۆیان هەیە سەردانی گۆڕی خۆشەیستان و نزیکانیان بکەن، بەڵام بە مەرجی پاراستنی ئەدەب و داپۆشراوی و لە سنوری شەرعدا، دایکی ئیمانداران، خاتوو عائیشە سەردانی گۆڕی عەبدوڕەحمانـــی برای کرد، پێیـــان وت: ئایا پێغەمبەری خوا نەهی نەکردووە لە زیارەتی گۆڕســـتان، فەرمووی: (نَعَمْ، ثُـمَّ أَمَرَ بِزِيارَتِها) بەڵێ یەکەمجار نەهی کرد لەوەی سەردانی گۆڕستان و گۆڕی کەس و ئازیزانمان بکەین، بەڵام پاشـــان فەرمانی کرد بە ســـەردانی گۆڕی خۆشەویستان، ئەم فەرموودەیە (أَخْرَجَهُ الحاكم في المُسْتَدْرَك، وَصَحَّحَهُ الأَلْباني في الأَرواء ج ٣ ص ٧٧٥).

خۆ ئەگەر یەکێ بپرسێ: باشە خۆ ئەو فەرموودەیە (حَسَنٌ صَحيح) ە، کە صەحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وەکو ئەبو هورەیرەو حەســـانی کوڕی سابت و ئیبن عەبباس و غەیری ئەوانیش دەفەرموون: (لَعَنَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) زَوراتِ القُبُورِ).

واتـــە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرەتی کـــردووە لەو ئافرەتانەی هەمیشە وا لەسەر قەبرستانن.

لە وەڵامدا دەڵێین: فەرموودەکە بە لەفظی: (زَوَّرات) هاتووە، نەك (زائِـرات)، چونکە (زَوَّارات) صیغـــەی موبالەغەیە، واتە: ئەو ژنانەی کە بەردەوام لەسەر قەبرانن، بە قەرەباڵغی و خۆگۆڕین و بەکۆستەر

بــە دوای ئەم و ئــەو دەگەوێ، ئەمە چییە لەگــەڵ ماڵی فلاَن کەس دەچنە ســەر قەبران، چونکە ســێ ڕۆژانەیەتی، یان چلەیەتی!! تەنها لەبەر ئەوەی فلاَن کەس خزمیەتی و ئەگەر نەچێ گلەیی لێ دەکات، ئــەم ژنانە کــە ئاوا ماڵ و مناڵ و مێردو میوان پشــتگوێ دەخەن و خواخوایانــە بزانن لە کوێ ســێ ڕۆژانەیەك هەیەو بچن بەشــداری سەرقەبران بکەن، جا ئەم ژنانە کە بەم جۆرە بێ شەرعییە دەچنە سەر گۆڕستان بە لەعنەت دەکرێن، چونکە سەردانی گۆڕستان وەفادارییەکە بۆ مردوو، وە دڵی پێی خۆش دەبێت، وە هەســتی پێ دەکات، بۆ ئەو کەســەش کە ســەردانی گۆڕێك دەکات ســوودەکەی ئەوەیە مەصیرو چارەنووسی خۆی دێتەوە یاد، قیامەتی دێتەوە بیر، ئەم دونیایەی کە ئاوا باوەشــت پێدا کردووە، هەر دەبێ تۆش ئاوا ڕۆژێك هەر بە جێی بێڵی، ئەمانە هەمووی لەگەڵ تۆ دەژیان، زۆربەیان گەنج و لاو بوون، مناڵ و تازەپێگەیشــتوو بوون، ساغ بوون، دەوڵەمەند بوو، کەچی لە پڕ گەیشــتنە ئەم شــارە بێدەنگە. پێغەمبەری خۆشەویستمان، نوری چاوو تاجی ســەرمان (ﷺ) فەرمووی: (كُنْــتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيــارَةِ القُبُور، فَزُورُوها، فَإِنَّها تُذَكِّرُ الآخِرَة) رَواهُ مُسْلِم: ١٩٧٧.

واتە: جاران من ڕێگریم لێ دەکردن لەوەی کە سەردانی گۆڕستان بکەن، بەڵام ئێســتا ڕێگاتان پێ دەدەم و بڕۆن ســەردانی گۆڕســتان بکەن و ســەر لە گۆڕی مردووەکانتان بدەن، چونکە بە ڕاســتی بە سەردانی گۆڕی مردووەکان مرۆڤ قیامەتی بیردەکەوێتەوە.

بەڵێ بە ڕاستی گۆڕ ئامۆژگاری کارێکی گەورەیە، کاتێ لەسەر گۆڕ ڕادەوەستین بە ئاشکرا قسەمان لەگەڵ دەکات و ئامۆژگاریمان دەکات، دەبا گوێ بۆ گۆڕ (قەبر) بگرین بزانین چیمان پێ دەڵێ:

(ئەمڕۆ تۆ لەسەر پشتمی و ئازادی و ژیان دەگوزەرێنی.. بە ئاگا بە سبەی دەبیتە میوان لە ناخمدا، ئەمڕۆ هەمەڕەنگ نازو نیعمەت دەخۆی لەسەر پشتم... ئاگادار بە سبەی کرم و مار دەتخوا لە ناخمدا، ئەمڕۆ تۆ پۆشاکی جوان ئەپۆشی و ناز ئەکەی لەسەر پشتم... هۆشیار بە سبەی کاڵاکەت کفنە لە ناخمدا، ئەمڕۆ ئاپۆڕایە، دەورت جەمە لەسەر پشتم... بەڵام سبەی ڕاکشاوی لە ناخمدا، ئەمڕۆ ئەدوێی بە ئارەزوو گفتوگۆتە لەسەر پشتم... ئامان بە ئاگابە سبەی مات و خامۆشی لە ناخمدا، ئەسرینی پەشیمانی ئەگەر ئەمڕۆ هەڵوەرێنی لەسەر پشتم... سبەی بەختیارو کەیف خۆشی لە ناخمدا، بیرکەرەوە، ئەوەی بۆ گەمەو ڕابواردن بژی لەسەر پشتم... سبەی بێسنوورە ئاهو ناڵەی لە ناخمدا، هەر لەحزەیە دەگوزەرێ لە تەمەنت لەسەر پشتم... چاك بیزانە وادەی کۆچت بۆ ناو ناخم نزیك دەکا، ژیربە سەرنجی تێپەڕبوونی شەوو ڕۆژتە لەسەر پشتم.. چونکە لەناکاو کتوپڕ خۆت ئەبینی لە ناخمدا، هەموو ڕۆژێ تۆ دەبینی لە سەر پشتم چەندین مرۆڤ... جێ هەواریان دەگوێزنەوەو دەبنە میوان لە ناخمدا، دە بزانە ڕۆژێ دێت و سەرەش دێتە سەر تۆ... ڕێبوارییت کۆتایی دێ و خۆت دەبینیەوە لە ناخمدا، خۆ ئەگەر

خوانەخواســتە یاخی و بێئاگا بی لەسەر پشتم... قوڕبەسەرت، ئاه هەڵکێشە بۆ ئەو ساتەی ئەیبەیتە سەر لە ناخمدا.

ئیماندارانی بەڕێز: باسێك لە بارەی تەعزیەی ژنان کە دەچن بۆ پرسە، ئایا چۆنە لە ڕوانگەی شەرعەوە؟ بەبێ گومان ئافرەت هەست و ســۆزو عاتیفەی لە پیاو زیاترە، وە بە مردنی کەسی خۆشەویست و نزیکی زیاتر دڵی بریندارو خەمبارو مەحزون دەبێ، وە پێویستە لــەو کاتەدا خەڵکانێك بــە تایبەت کۆمەڵێ ئافرەتی دیندارى بەڕێز بە دەوریەوە بن و دڵنەوایی بکەن و خزمەتی ماڵ و منالی بکەن تا سێ ڕۆژ، چونکە بێگومان مردن ئەوەندە کاریگەری هەیە بە تایبەت لەســەر ئافــرەت لە کاتی مردنی دایك و بــاوك و براو مێردو منالْ و خوشــك و کەسانی نزیکیدا، کە زۆر زیاتر لە پیاو غەمبار دەبێ.. فەموون با بەیەکەوە سەرێك لە ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەین بزانین خاتوو فاتیمەی کچی و خاتوو عائیشەی هاوسەری چیان لێ بەسەرهات و حاڵیان چۆن بوو کاتێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەفاتی کردو دونیای فانی بەجێ هێشت!

عَنْ أَنَس، قالَ: لَمَّا ثَقُلَ النَّبي (ﷺ) جَعَلَ يَتَغَشّـاهُ الكُرَبُ فَقالَتْ فاطِمَةُ: واكَرْبَ أَبَتاهُ. فقالَ: لَيسَ عَلى أَبيكِ كَرْبٌ بَعْدَ اليَوْمِ).

واتــە: کاتــێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوحمــان بە قوربانی بێ لە دوا ســاتەکانی ژیانیدا بوو، ئازاری زۆر بوو، فاتیمەی کچی هاتە لای، کە باوکی شیرینی بەو حاڵەوە بینی، خۆی بۆ نەگیراو هاواری

کرد: ئای لەدەســت ئێش و ئازارو سەغڵەتی و ناڕەحەتی باوکم، کە چەند ئازار دەچێژێ، ئای باوکی شــیرینم خۆزگە ئاوا نەمبینیتایە.

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ڕۆڵە گیان لەمڕۆ بەدواوە ئیتر ئازارو ناڕەحەتی لەسەر باوکت نەما، ئەمجا ئەنەس دەفەرموێ: کاتێ پێغەمبــەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد، فاتیمە فەرمووی: (ياأَبَتَاهُ أجابَ رَبّاً دَعاهُ... ياأَبَتَاهُ جَنَّةُ الفِرْدَوسِ مَأْواهُ.. يا أَبَتَاهُ، إلى جِبْرِيلَ نَنْعاهُ).

واتــە: ئەی باوکی شــیرینم، خوا بانگی کــردی بۆ لای خۆی و تۆش چوویت بە دەنگییەوە، ئەی باوکی شیرینم بەهەشتی بەرین و فیردەوس جێگەتە، بابە گیان پەیامی مەرگی پیرۆزت بە جوبرەئیل دەگەیەنیت.. پاشان کە پێغەمبەری خوایان (ﷺ) خستە گۆڕەوەو دایان پۆشی، خاتوو فاتیمە فەرمووی: (أَطابَتْ أَنْفُسَـكُمْ أَنْ تَحْثُوا عَلى رَسُـولِ اللهِ (ﷺ) التُرابَ؟) ئەوە چۆن دڵتان هات، چۆن چاوتان بەرایی دا کە گڵ بکەنە سەر لاشەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).. ئەم فەرموودەیەی: (رَواهُ البُخاري: ٤٤٦٢).

خاتوو عائیشــەش دەیفەرموو: (صُبَّتْ عَلَيَّ مَصائِبٌ لَوْ أَنَّها... صُبَّتْ عَلى الأَيّامِ صِرْنَ لَيالِيَ).

بەڵــێ ئــاوا مردنی خۆشەویســتان و دابڕان لێــی ڕۆژی ڕووناك دەكات بە شەوی تاریكستان.

ئیمانداران: ئایا دروستە ئافرەتان دابنیشن بۆ تەعزیەو ئافرەتان بچن بۆ لایان؟!

دەچینــە خزمەت ئەم فەرموودەیە: روى البُخاريُ بِإِسـنادِهِ عَنْ عُرْوَةَ

عَنْ عائِشَةَ: أَنَّها كَانَتْ إِذا ماتَ المَيِّتُ مِنْ أَهْلِها فاجْتَمَعَ لِذلِكَ النِّساءُ، ثُمَّ تَفَرَّقْنَ إلاّ أَهْلَهـا وخاصَّتَها، أَمَرَتْ ببرمة مِـنْ تَلْبِينَة، فطبخت ثُمَّ صَنعَ الثريدَ فَصَبَّتْ التَلبِينَة عَلَيها ثُمَّ قالَتْ: كُلْنَ مِنها فَأَنّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: التَّلْبِينَةُ مجمَّة لِفُؤادِ المَرِيضِ، تَذْهَبُ بِبَعْضِ الحُزنِ) فَتْحُ الباري ج ٩ ص ٦٨١.

واتە: کاتێ کەسـێك لە بنەماڵەی خاتوو عائیشە دەمردو ژنان بـۆ دڵنەوایی لێیان کۆدەبوونـەوەو دوعای خێریان بۆ مردووەکە دەکردو دڵخۆشـی کەسوکاریان دەدایەوە، پاشـان تەواوی ژنەکان بڵاوەیـان لێ دەکـردو هەریەکەیان دەچوونـەوە بۆ ماڵ و حاڵی خۆیان، تەنها خزم و کەسـی هـەرە نزیکی مردووەکە دەمانەوەو ئەوانـەی زۆر لێیـان نزیکـن، تەنها ئـەو ئافرەتانە لـە دەوری ئافرەتانی خاوەن پرسە دەمانەوە، ئەمجا خاتوو عائیشە فەرمانی دەکرد جۆرێك خواردنی تایبەت دروسـت بکەن و پاشـان بیکەن بە توێکوشـراوو ئافرەتانی خاوەن پرسـە بیخۆن، چونکە خاتوو عائیشـە دەیفەرموو: من لە پێغەمبەی خوام (ﷺ) بیسـتووە کە ئەم جۆرە خواردنە بۆ دەروونی نەخۆش باشـەو خەم و حوزنی خەمبارو دڵبەخەمیش لادەبات..

جـا لێرەدا دەبینین کە خاتوو عائیشـە بۆ خۆشـی ئافرەتان لە دەوری دانیشتوون لە کاتی تەعزیەدا بەڵام ئەگەر بە جوانی سەرنجی فەرموودەکە بدەین دەبینین کە باسی ئەوە دەکات ژنەکان، ئەوانەی کە بێگانەو ناسـیاو بوون، زۆر بڵاوەیان لێ کردووەو تەنها کەسانی

نزیکـی خزمی ئـەو بنەماڵە ماونەتەوە، نـەك وەکو ئەمڕۆ ئەوەی نەناسیاوو بێگانەیە زۆرتر دەمێنێتەوە لە خزمەکە!!

فەرموودەیەکـی تر لە بارەی تەعزیـەی ژنانەوە: (عَنْ ابنِ عَمْرُو، أَنَّ النَـّبي (ﷺ) قَالَ لِفاطِمَةَ: ماأَخْرَجَكِ يافاطِمَةُ مِـنْ بَيْتِكِ؟ قالَتْ: أَتَيْتُ أَهْلِ هذا الَمَيِّتِ، فَتَرَحَّمتَ إِلَيهِمْ مَيِّتَهُمْ، أَو عَزَّيْتُهُمْ بِهِ) حَديثٌ حَسَـن، رَواهُ أَبُو داود والنَسائي.

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فاتیمەی کچی پرسی: ئەی فاتیمە بۆچی لە ماڵ چوویتە دەرەوە، چ پێویستی و کارێکت هاتۆتە پێش وا ماڵ هێناویتیە دەرەوە؟ فاتیمەش فەرمووی: چوومە لای کەسوکاری ئـەو مردووەو دڵـم دانەوەو لە بارەی مردووەکەیانەوە پرسـەم لێ کـردن و داوام لـە خوا کرد سـێبوریان بـدات و مردووەکەیان بە بەهەشت شاد بکات.

بەڵام ئایا ئەم تەعزیەی ئەمڕۆی ژنان شـەرعییە؟! نەخێر، بەم بەڵگانە:

١-تەعزیـە واتـە دڵدانـەوە، دەی دڵـی خـاوەن مـردوو بە کێ دەکرێتەوە؟! بێگومان بە کەسی خۆشەویست و زۆر نزیك و دڵسۆزو موسـڵمان و ڕێکوپێك، بەڵام سەرنج بدەن، زۆربەی هەرە زۆری ژنی ئەمڕۆ کە دەچێ بۆ تەعزیە، نەك هەر دۆسـتایەتی لەگەڵی نییەو پێشـتر تامەزرۆی بینینی یەکتر نەبوون و دڵیان بە بینینی یەکتر شاد نەبووە، بەڵکو هەر ماڵیشیان نەزانیوە، لە دەیان کەس دەپرسێ:

ئەری ماڵی تەعزیەکە کامەیە؟! توخوا تۆ تا ئێستا نەچووبی بۆ ماڵیان و لە نەخۆشـیدا سـەردانت نەکردبێ و دەرگای ماڵت نەکردبێتەوە، ئیتر بۆچی دوای مردنی ئەچی بۆ تەعزیەکەی؟!! دەچی تەنها باری خاوەن پرسە قورستر دەکەی!..

٢-ژن کە دەچێ بۆ تەعزیە وەکو خاتوو فاتیمە فەرمووی: چووم دڵـم دانەوەو لە بـارەی مردووەکەیانەوە دڵنەواییـم کردن، بەڵام زۆرێـك لـە ژنانـی ئەمڕۆ کە دەچن بـۆ تەعزیە یـان دەچێ دڵی ئافرەتانی نزیکی مردووەکە زیاتر بە خەم دەکاو دەسـت دەکات بە گریان و ئەگەر تۆزێ ئارامیان گرتووە، برینیان دەکولێنێتەوە، یاخود بۆ کات بەسـەر بردنی خۆی دەچێ بۆ هەموو پرسـەیەك، چونکە بێکارو دەسـت بەتاڵە، ماڵ و مێـردو منالی بەرەڵا کردووەو حەزی لە قسـەو باس و دەنگوباسـی ناو ژنانەو لە تەعزیەکەدا، لە جیاتی دوعایەکی خێر بۆ مردووەکەو دڵنەوایی کردنێکی خاوەن پرسـەکە، لەم ژن دەپرسێ ئەو کراسەت بە چەند کڕیوەو گوارەکەت عەیارەی چەندە، کچەکەت شووی کردووە، ئەی ئەو کچە هی کێیە؟

یـان بۆیە دەچێ بـۆ تەعزیە بۆ ئەوەی خـۆی دەربخات، ئەگەر کراسـێکی گرانبەهـای کردبێ یان پارچـە ئاڵتوونێکی هەبێ، لەوێ خـۆی پێوە بادەدا!! وا ئەزانێ چووە بۆ شـایی و ئاهەنگی بووك!!! برایـەك وتی: جارێـك تەعزیەمان هەبـوو، دوای تەعزیەکە دایکم وتـی: گوێم لە ژنێك بوو بە ژنێکی ڕەفیقی خۆی دەگوت: خوا لەم

مردووە خۆش بێ، بە هۆی تەعزیەی ئەمەوە یەکتریمان بینی و بۆ خۆمان تێر قســە بووین!!! یان ژنـــی وا هەیە لە جیاتی دڵدانەوەی ژنانی نزیکی مردووەکە، لۆمەیان دەکات و تانەیان لێ دەدات بەوەی کە دەڵێ: ئەرێ خۆ هەر بۆی نەگریان و دەنگیان بەرز نەدەکردەوە!! حەز دەکات بیلاوێننەوەو یەخەدادڕن و ســەر لە قوڕ گرن، ئەمیش وەکو فیلم تەماشایان بکات!!

٣-لە ســەرەتاوە وتمــان تەعزیە بۆ ئەوەیە دڵــی خاوەن مردوو بدەیەوە، نەك بێزاری بکەی، بەڵام ئەمڕۆ زۆربەی خەڵکی بە ئاشکرا دەڵێ: بە ڕاســتی لــە تەعزیەی ژنان بێزارم، ئەوەتا بە ئاشــکرا بە ئافرەتان دەڵێن: مەیەنە ناو خانووماڵەکەمانەوەو پیسی مەکەن لەو سەر جادە ڕەقە، لەو سەر ڕێگای خەڵکە، لەو بەردەم ماڵی گەڕەکە، خێمــەو چادرت بۆ هەڵدەدەین، ئەی ئەو ژنەی کە دێی بۆ تەعزیە، تــۆ هــەر ئەوێت قابیلە، پێم حەیفە قاچ بخەیتــە ناو ماڵەکەم، بە کوردی و بە کورتی دەڵێ: بڕۆ وازم لێ بێنە!! بە داخەوە کەســـی وا هەیــە تەعزیەی کردووە بە مایــەی لە کۆڵ خۆکردنەوەی پیرەژنی بەتەمەن، کە لە جیاتی لەســەر چاویــان بگرن و خزمەتیان بکەن، دەیانبــەن بۆ تەعزیەیــەك و لەوێ بەجێیان دێڵــن و دوایی لێیان ناپرســنەوە! برایەکی زۆر ڕاســتگۆو جێگای متمانە بۆی باســکرم، کــە تەعزیەیان هەبــوو، چەنــد ڕۆژ دوای تەواوبوونـــی تەعزیەو هەڵگرتنەوەی خێمەکان، دوو پیرەژنی بەســاڵاچوویان لا ماوەتەوە،

کە هیچ کات ناسیاویان لەگەڵیان نەبووە، تەنانەت ئەو پیرەژنانەش نەیـان زانیـوە ئەمە تەعزیـەی کێیەو کێ مردووە! کەسـیش لێی نەپرسـیونەتەوە، ناچار بردوویانن لە نەقلیاتێك بەرەلایان کردوون و ئەوانیـش لە کۆڵ خۆیان کردوونەتەوە!! ئایا ئەم تەعزیەی ژنانە بەم شێوەی ئێستا سووکایەتی نییە بە ئافرەتان؟!

کەواتە: خوشـکان بۆ حورمەتی خۆتان واز لەم خووە ناشـیرینە بێنـن، برایان بە ڕاسـتی جـوان نییە بۆ هـەر تەعزیەیەك چووی ژنەکەشـت لەگەڵ خۆت ببەی. توخوا کەسێك بە ئامادەبوونی خۆت نەزانێ، ئایا بە چوونی ژنەکەت بۆ تەعزیەکەیان سوپاست دەکات؟!

بەڕێزان: لە کۆتایی ئەم وتارەشدا دەمەوێ ئاماژە بۆ دوو خاڵ بکەم:

خاڵـی یەکەم: زانایـان دەفەرموون: (تسـنُ تَعزِيَةُ المُصـاب). بەلام نەیـان فەرمووە: (تَسـنُ تَعزِيَةُ القَريبِ، لأنَّ القَريـب رُبَما لايُصابُ بموت قَريبِهِ، والبَعيدُ يُصابُ لِقُوَّةِ صَداقَةِ بَيْنَهُما مَثَلاً).

واتە: سـوننەتە تەعزیەو دڵنەوایی لەو کەسـە بکرێ کە بە هۆی مردنی ئەو مردووەوە دڵی ناڕەحەت و غەمبار بووەو کۆستی کەوتووە، بەڵام زانایان نەیان فەرمووە: سـوننەتە تەعزیەو پرسـە لە نزیکان و خزمانـی مردوو بکرێ، چونکە هەندێ جار کە کەسـێك دەمرێ، ئەوەندەی کە هاوڕێ و دۆسـتێکی دڵسـۆزی خۆشەویستی کە لەبەر خوا خۆشـی ویستووە، کاریگەری مردنی ئەو کەسەی لەسەر دەبێ و پێی مەحزون و غەمبار دەبێ و بۆی بە پەرۆشـەو دڵی بۆی تەنگە،

نیو ئەوەندە خزمێکی نزیکی کە ئەو مەحەبەت و خۆشەویستی و تێکەڵییەی لەگەڵی نەبووە، کاریگەری ئەو مردنی خزمەی خۆی لەسەر نییەو پێوەی دیار نییە.. بەڵام ئێستا تەعزیەو پرسە تەنها لە کەسی نزیك و خزمی نزیکی مردووەکە دەکرێ، ئەگەر چی لە ژیانیشدا هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکەوە پتەو نەبووبێ، هی وا هەیە چەند ساڵ بووە نەچۆتە ماڵی براکەی، هەموو ژیانی دژایەتی کردووەو بە چاوی سووك سەیری کردووە، بڕوا بکەن کەسی وا هەبووە نەخۆش بووە، بۆ چەند دینارو دۆلارێك ئاتاج و موحتاج بووە، لەو لاوە ئامۆزاکەی یەکێ لە خاوەن کۆمپانیاکان بووە، کەچی ئامادە نەبووە لەسەر حیسابی خۆی عەیادەی دکتۆرێکی پێ بکات، هاوکارییەکی ماڵ و مناڵە داماوەکەی بکات! ئەمجا کە مرد لە تەعزیەکەیدا ڕادەوەستێ و خەڵکی سەرەخۆشی لێ دەکەن! ئەمە دروست نییە تەعزیەی لێ بکرێ، بەڵکو ڕاستتر وایە ئەگەر بگونجایە، دەبو بووترایە پیرۆزبایی مردنی ئامۆزاکەی لێ بکرایە! چونکە لە دڵی خۆیدا دەڵێ باش بوو مردو لە کۆڵم بۆوە!! کەچی بە داخەوە وەکو ڕۆتین لەسەر لافیتەکەی دەنوسرێ، فلان کەس مردووە، ئامۆزای فلان کەسە! بەڵام لە هەمان کاتدا بێگانەی وا هەبووە کە هەرچی لە توانایدا بووە بۆ ئەو مردووەی کردووە لە کاتی نەخۆشی و هەژاری و موحتاجیدا، دەی بە ڕاستی پێویستە تەعزیە لەو کەسە بکرێ، لە لە ژیاندا بۆ ئەو مردووە هەبووەو بە دەمیەوە بووەو خەمخۆری بووە.

بەڕێزان: یەکێکی تر لە کارە ناشـیرینەکانی ناو تەعزیە، بریتیە لە: تەوقەکردنی ناو تەعزیە، زۆر کەس لە کاتی هەڵسان لە تەعزیە تەوقە لەگەڵ کەسوکاری مردوودا دەکات، جا ئەم کەسانە مەبەستیان ئەوەیــە کــە بە خاوەن پرســە بڵێن ئــەوە ئێمەیــش هاتووین بۆ پرسەکەت و ئاگادار بەو بمان بینە، لەبەر ئەوە پێویست ناکات ئەم تەوقەکردنە، هەروەها هەندێ کــەس هەیە هەر بە تەوقەکردنەوە ناوەســتێ بەڵکــو ئەملاولای خاوەن پرســەش مــاچ دەکات!! کە بە ڕاســتی ماچکردن لەم کاتەدا زۆر ناشــیرینە! (وَقَدْ كره كثيرٌ مِنْ أَهْلِ العِلم المُعانقة والتَّقبيلُ مِنَ الرَّجُل لِلرَّجُل إلاّ لِلْقادِم مِنَ السَّفر).

واتە: زۆرێك لە زانایان بە ناپەسەندیان زانیوە کە پیاو باوەش بە پیاودا بکات و ئەملاولای ماچ بکات، مەگەر کەســێك لە ســەفەرێکی دوورو درێژ گەڕابێتەوەو زۆر موشتاقی بینینی یەکتر بن!

خاڵــی دووەم: ئایا دروســتە تەعزیە لە غەیرە موســڵمان بکرێ، کاتێ مردوویەکی لێ مرد؟

لە وەڵامدا دەڵێین: (يَجُوزُ لِلْمُسْلِمِ أَنْ يُعَزِّي غَيْرَ المُسْلِمِ فِي مَيْتِهِ وَهذا قَوْل جُمهُورِ أَهْلِ العِلْم).

واتە: دروستە بۆ موسڵمان کە تەعزیەو پرسە لە غەیرە موسڵمان بــکات، لە کاتێکدا مردوویەکی خۆشەویســتی لــێ دەمرێ، ئەمەش بۆچوونــی کــۆی زانایانی خاوەن زانســتی شــەرعییە، بــە تایبەت ئەگەر ئەو ناموســڵمانە دراوسێت بوو، بەڵام ئەوەندە هەیە نابێ لە

تەعزیەکەدا بڵێی: خوا لە مردووەکەت خۆش بێ، چونکە مردووەکەی موسـڵمان نەبـووەو بە کافری مردووە، ئـەی بڵێی چی؟ لە (مُغْني) إبْـنُ قُدامَـة ج ٢ ص ٥٤٦دا، دەفەرموێ، وا چاکـە بڵێی: (أَعطاكَ اللهُ عَلى مُصيبَتِكَ أَفْضَل ماأَعْطى أَحَداً مِنْ أَهْلِ دينِكَ)، وە لە کتێبی: (أَحْكام أَهْل الذِّمة)شـدا، ج ١ ص ١٦١دا دەفەرموێ: وا چاکە پێی بڵێی: (الهَمَكَ اللهُ الصَّبْرَ وأَصْلَحَ بالَكَ) یان پێی بڵێی: (لايُصيبُكَ إلاّ خَير).

خوای گەورە لەسەر ئیسلام و ئیمان بمانژێنێ و بمانمرێنێ و لە مردووەکان خۆش بێ و عاقیبەتمان بەخێر بگێڕێ. اللهُمَّ آمين

## سەرچاوەکان:


١-مردن و ژیانی ناو گۆڕ. محمد ملا فائق ل ٦٢، ل ٦٧، ل ٦٩، ل ٧٣، ل ١١٠، ل ١٣٨.

٢-فَتاوى وَأَحْكام بَريد الإسلام، د. أَحمد علي طه رَيّان، ص ٢٣٧.

٣-أَحْكام الجَنائِز، محمد حَسّان، ص ٢٩٤.

٤-شَرح رياض الصّالِحين، إِبْنُ عُثيمين، ج١ ص ٩٢.

٥-يَسأَلُونَكَ، د. حسان الدِّين عَفانَة، ج ٣ ص ٢٥٦، ص ٢٥٨.

اللهم اغفر لحينا ولميتنا وصغيرنا وكبيرنا وذكرنا وأنثانا وشاهدنا وغائبنا.

اللهم من أحييته منا فأحيه على الايمان.

اللهم اغفر لجميع موتى المسلمين الذين شهدوا لك بالوحدانية، ولنبيك بالرسالة وماتو على ذلك، اللهم اغفر لهم وارحمهم وعافهم واعف عنهم، وأكرم نزلهم ووسع مدخلهم واغسلهم بالماء والثلج والبرد، ونقهم من الذنوب والخطايا كما ينقى الثوب الابيض من الدنس.

اللهم وانزل على قبورهم الضياء والنور، والفسحة والسرور، وجازهم بالحسنات احسانا وبالسيئات عفوا وغفرانا حتى يكون في بطون الالحاد مطمئنين، وعند قيام الاشهاد من الآمنين، وبجودك ورضوانك واثقين، والى أعلى علو درجاتك سابقين برحمتك يا أرحم الراحمين.

اللهم انقلهم جميعا من ضيق اللحود، ومراتع الدود الى جنات الخلود في سدر مخضود وطلح منضود وظل ممدود وماء مسكوب.

اللهم لاتفتنا بعدهم واغفر لنا ولهم.

اللهم وارحمنا اذا صرنا الى ما صاروا اليه تحت الجنادل والتراب وحدنا.

اللهم وارحمنا اذا غسلنا اهلونا.

اللهم ارحمنا اذا كفنونا.

اللهم ارحمنا اذا حملونا على اكتافهم وساروا بنا الى قبورنا واغلقوا بابها.

اللهم فاجعل قبورنا روضة من رياض الجنة ولا تجعلها حفرة من حفر النار.

اللهم ارزقنا قبل الموت توبة وعند الموت شهادة، وبعد الموت جنة ونعيما.

اللهم مر ملك الموت ان يكون عند قبض ارواحنا رحيما، وعند نزعها شفيقا.

**اللهم هون علينا سكرات الموت.**

**اللهم يا سامع الصوت، ويا سابق الفوت، ويا كاسي العظام لحما بعد الموت، نعوذ بك اللهم من عذاب القبر، ومن سؤال منكر ونكير، ومن أكل الديدان، وبيض وجوهنا ويمن كتابنا وثبتنا على الصراط حتى لا نهوى على رؤوسنا.**

**اللهم فاصرف عنا عذابها ان عذابها كان غراما انها ساءت مستقرا ومقاما.**

**اللهم ان بشرتنا لاتقوى عليها.**

**اللهم انا وجوهنا لاتقوى عليها.**

**اللهم ان جنوبنا لاتقوى عليها، اللهم ان ظهورنا لاتقوى عليها.**

**اللهم انا نسألك بوجهك الكريم ان تعيذنا من نارها وحرها.**

**اللهم انا نسألك بوجهك الكريم الجنة، ونعوذ بوجهك الكريم من النار.**

**اللهم اجعلنا ممن يمشي على الصراط سريعاً، فينجو من حرها ولهبها الى جنات النعيم، ولا تجعلنا ممن يزحف على الصراط، ثم يهوى فيها برحمتك يا ارحم الراحمين.**